# ئارامیه



ئارامیه

عمر آل عوضة


جزیری
JEZIRY

وەرگێرانا
مصطفى أحمد

8 تموز ١٨٧
دهوك

# ئارامـــــــبه

عمر آل عوضه

وەرگێڕان
مصطفى احمد

- نافێ پەرتووکێ : ئارامبە
- نڤیسەر : عمر آل عوضە
- وەرگێران : مصطفى احمد
- دیزاینا بەرگی: ئەیوب گارە
- دیزاینا ناڤەروکێ : ئەواب ئەحمەد
- پێداچونا زمانی : هێرش کەمال رێکانی
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە : تەهران
- ژمارا سپارتنێ : ISBN :500-700-12
- چاپا ئێکێ : 2018

ژ چاپ و وەشانێن کتێبخانا جزیری – دهوك

دهوك – جادا کاوە - MOB: 0750 4588806

# پێشەکی

حەمدو سۆپاسی بو خودایێ مەزن و سلاڤ ل سەر پێغەمبەرێ مە ((محمد))ی بن .... و ل دووڤ دا

ئەڤ پەرتووکە پێکهاتیە هندەك ژ وان هزران یێن من نڤێسایین داکو ب ئانەهیا خودێ روحا هەمی خەلکی بهێز بکەت ، و هەروەسا مە نێزیکی خودێ بکەت .

چێدبیت هوین پرسیار بکەن چەوا ئەز دێ ڤان هزران نڤێسم و هەروەکی ئەز دزانم دونیا یا چەوایە و کەسەکێ دانعەمرم ؟!!

ئەز د ژیێ خودا یێ بچویکم بەلێ من گەلەك سەربورێن ب زەحمەت دژیانا خودا یێندیتین ، و هندەك تشت یێن هەین ژبلی خودێ کەس نزانیت ، و هندەك رویدانن چیا ل بەر دهەژیێن ، بەلێ خودایێ مەزن هێز و شیان یێن داینە من دا بشێم چەوا سەرەدەریێ دگەل دا بکەم ... و ل سەر زال ببم و پەند و شیرەتان بوخو ژێ وەربگرم .

ڤان هزران بخوینە و باش هزر تێدا بکە ، چونکی ئەگەر هوین هزرا خۆ د وان پەیڤان دا بکەن ... ب ئانەهیا خودێ دێ هەست ب ئارامیێ و هێزا ئەرێنی بوونێ کەن .

عمر آل عوضة

### ئارامبه

خۆل شوونا من بدانه ، و هزرا هەر پەیڤەکێ بکە یا تۆ دبێژیە هەر کەسەکی ل دەوروبەرێ خۆ .

پرسیارێ ژ خۆ بکە : ئەرێ تۆ یێ رازی ڤێ پەیڤێ بۆ خۆ قەبوول بکەی ؟

ئەگەر تە خو ژ وێ چەندێ پشتراستکر و تە خۆ ل شوونا وی کەسێ بەرامبەر دانا ، ل وی دەمی تۆ کەسێ ژ دەست نادەی .



## ئارامبە

ئەجەل ژ دەڤ خودێ یا هاتییە نڤێسان ، نە ترسە .

هەر تشتەك ژ دەڤ خودێ یێ هاتیە دانان و نڤێسان ؛ ئەگەر هەمی ئەجنە و گیانەوەر و چیا و دەریا کۆم ببن داکو زیانێ بگەهیننە تە ، نەشێن وێ چەندێ بکەن ، ئیللا ئەگەر خودێ دناڤ پەرتووکا تەدا نڤێسابیت ، پێدڤی ب ترسێ ناکەت و تۆ یێ ژ خۆ پشتراستبە .

❀•●●—☺ئارامبه☺—●●•❀

ژ جوانترین وان هیڤییێن د ژیانا تەدا خوشتڤییێ تەیە یێ تۆ هەردەم دناڤ خەیالێن خودا ب ئاقلێ خو دبینی ، و یێ تە ژبلی وی نەڤێت دگەل کەسەکێ دیتر بمینی ، و ئەگەر تە ئەڤ هیڤییە بجه ئینا و تۆ گەهشتیێ ؛ ل وی دەمی دێ هەمی هیڤییێن پشتی وێ ژناڤ بەی و پویچ کەی ، چونکی تۆژی دزانی ئەگەر تە ئەو بجه ئینا دێ دگەل میرێ هیڤیانبیە شاه.



گەلەك جوانە تۆیێ سەرکەفتی بی و نەهێیە شکاندن .

بەلێ پا گەلەك وێ هزرێ دکەن حەژ خو کرن ؛ خو مەزنکرن و هەست نەکرنە ب هەستێن کەسێن دیتر ، و نەگرنگی پێدانا من ب هەر کەسەکی ل دورماندورێ خو سەرکەفتن مەزناهی و خو نەشکاندنە ، و ئەڤ بیرو باوەرا پویچ بەلایە چونکی دێ پەیوەندیێن تە دگەل کەسێن دیتر تێکدەت ، حەژ خوکرن خوراگری و بەردەوامییا منە ل هەر دەمەکێ من هیڤیەك و ترسەك و پێدڤییەك هەبیت .

گەلەك ب کورتی :

کەرامەتا من گەلەك ژ ئامادەبوون و هەبوونا من مەزنترە .

چونکی مرنا من ب کەرامەت گەلەك باشترە ژ هەبوونا من ب بێ کەرامەت .

☸•●•●—☺نارامبه☺—●•●•☸

پرسيارا نێتيمى نەكە كا ژبەر چ بابێ وى مرييە ..

و پرسيارا هەژارى نەكە كا ئەگەرێ هەژارييا وى چييە ..

و پرسيارا ئێخسيرى نەكە كا ژ بەر چ هاتيە زيندانكرن ..

راستە ب تنێ پرسيارە ، بەلێ ب راستى ئەو چەكەكە وان پتر ژ ئێتيميێ و هەژاريێ و ئێخسيريێ دئێشينيت.




زبەر خودێ ببورە ، زبەر خودێ لێ خوشببە ..بەلێ‌پا وی کەسێ شوونا بەرێنەدانێ ڤە بیّ ژڤان کەسان بیت :

١- خائین

٢- زۆردار

٣- مەکرباز یان فێلباز

چونکی ڤان هەمیان باشیا تە یا ژبیرکری ، و دابزانن ڤان کەسان تو بیّ ژ دەست دای نە تە ئەو ژ دەست داینە ..

ئارامبە .



خودێ دزانیت تۆ یێ ب خەمـــی و هەروەسا دزانیت تو ل سەر خەما خو یێ زالی .
و دزانیت زورداری یا ل تە هاتیە کرن و دزانیت دلێ تە یێ بریندارە ..
بەلێ بزانە خودێ دڤێت تۆ هەوارا خو بگەهینیە وی و تۆل بەرامبەری وی یێ شکەستی و زەلیل بی و ل وی دەمی خەمان بهێلە.
بێ هیڤی نابیت یێ دەستێن خو بۆ خودێ بلند بکەت و ب شکەستی هەوارا خو بگەهینتێ .
خودایێ مەزن نەڤێت بەندەیێ وی ب خەم بکەڤیت ، بەلکو خودایێ بەندەیا دڤێت گوه ل دەنگێ تە بیت لەوما تە توشی خەمان دکەت ، و دێ تە قورتال کەت چونکی ئەو پشتەڤانێ تەیە و ژ باشترین پشتەڤانایە .

❁•●●—☺ئارامبە☺—●●•❁

د هەمی رەوشەکێ دا یێ بەرفەرمانکری بە

چونکی تو دزانی پێدڤیا تە باشیا تەیان خێرا تە یا تێدا ؟!

دەمێ تو یێ بەرفەرمانکری بی ... تو یێ ڤەستا خودێ دکەی و باوەریا خو ددەیێ

هەڤالێن پێغەمبەری((خودێ ژ وان رازی بیت)) کارەك نەدهێلا ئەگەر یێ ب سانەهی با یان یێ ب زەحمەت با .

❁•●●—☺ئارامبە☺—●●•❁

دوو تشتا ج جاران ل دەف کەسێ بەحس نەکە :

ئێك : باشیێن خو دگەل خەلکی ؛ دێ بیە کەسەکێ نەخوشتڤی و منەتچی.

دوو : خرابیا خەلکی دگەل تە کری ؛ دێ یێ نازك و سادە و بێهەیبەت بی .

ئەم هەمی دزانین خودێ تورە دبیت و دلۆڤانیێ ب بەندەیێن خو دبەت ، بەلێ هەروسا بزانە :

**یا ئێکێ : خودایێ مەزن شەرمێ ژ بەندەیێ خو دکەت**

حەدیسا سەلمانی ((خودێ ژێ رازیبیت)) گوت : پێغەمبەرێ خودێ ((سلاڤ لێ بن)) گوت :

((... إن ربكم حيي كريم ، يستحي من عبده إذا رفع اليه يديه أن يردهما صفرا خائبتين))

ئانکو : ((خودایێ هەوە یێ ساخە و ل گونەها دبوریت ، شەرمێ ژ بەندەیێ خو دکەت ئەگەر دەستێ خو بلند کر رەتبکەت و ب دەست ڤالایی بزڤرینیت))

رواه أحمد وأبو داوود والترمذي وابن ماجه .

**یا دووێ : کەنیا خودێ ب بەندەیێ وی دهێت**

ئەبی دەردائی خودێ ژێ رازیبیت گوت : ((ثلاثة يحبهم الله ويضحك إليهم ، ويستبشر بهم فيقول الله : .... والذي لـه امرأة حسناء ، وفراش لين حسن ، فيقوم من اليل ، فيذر شهوته ، فيذكرني ويناجيني ، ولو شاء رقد...))

ئانکو : ((خودێ حەش سێ کەسان دکەت و کەنیا وی پێ دهێت ، ومزگینیێ بدە وان خودێ دبێژیت : ..... یێ ژنەکا باش هەبیت ، و جه خەومکێ نەرم و باش هەبیت ، ب شەڤ رادبیت ، شەهوەتا خو تێربکەت ، و بیرا خو ل مـن بینیت هەوارا خو بۆ مـن بینیت ، و ئەگەر ڤیا بنڤیت .....))

رواه الحاكم والبيهقي وحسنه الألباني .

**یا سێ یێ : خودێ غیرەتێ ژ بەندەیێن خو هەلدگریت**

ئەبی هورەیرەی ((خودێ ژێ رازی بیت))گوت: پێغەمبەری ((سلاڤ لێ بن)) گوت : ((إن الله تعالى يغار ، وغيرة الله تعالى أن يأتي المرء ما حرم الله عليه))

ئانكو :((غیرا خودێ رادبیت ، و غیرا خودێ ب وی تشتی رادبیت دەما كەسەك تشتەكی بكەت یێ وی حەرامكری))

متفق عليه

شەرم دكەت و كەنیا وی پێ دهێت و غیرا وی رادبیت هەروەكی ژەهژی و هێژای مەزناهیا وی ...

خودێ دبێژیت : ((لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ))

ئانكو: ((تشتەك ژ چێكیرێن وی وەكی وی نینە وئەو یێ گوهدێر و بینەرە))

لەوما بێ بەهر نابین ژ خێرێ ؛ ژ خودایەكی یێ شەرم دكەت و دكەتە كەنی و غیرا وی رادبیت .



ئەگەر نەفسا تە تۆخەمبار کری

فێ ئایەتێ بێژێ:((لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللهَ مَعَنَا فَأَنْزَلَ اللهُ سَكِينَتَهُ عَلَيْهِ)) ئانكو : ((بخەم نەكەڤە خودێ یێ دگەل مە هینگی خودێ دلرەحمەتییا خو ب سەردا رێت))

ئەگەر نەفسا تە داخازا گونەهێ ژ تە کر

بێژێ : ((قُلْ أَذَلِكَ خَيْرٌ أَمْ جَنَّةُ الْخُلْدِ الَّتِي وُعِدَالْمُتَّقُونَ))

ئانكو : ((ئەی موحەممەد بێژە وان ئەرێ ئەڤە ئاگرێ هوسا یێ دژوار بۆ هەوە چێترە یان ژی بەحەشتا هەروهەر هەی ، ئەوا پەیمان بۆ پارێزکاران پێ هاتیە دان ، دێ بیتە خەلاتو دووماهیکا وان))

ئەگەرتۆشی خەم و نەخوشیا بووی و خەلکی بەحسی تەکر

بێژە خەم و نەخوشیێن خو : ((وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ (٩٧) فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُنْ مِنَ السَّاجِدِينَ))

ئانكو : ((ب ڕاستی ئەم دزانین دلێ تە ، ب ئەوا ئەو دبێژن تەنگ دبیت (٩٨) ڤێجا تو ب پەسەند کرنا خودایێ خو ، خودایێ خو ژ کێم کاسیان پاقژ بکە ، و ژ سوجدە بەران بە)).

۞•●●—☺ئارامبە☺—●●•۞

خو رادەستی خەمان نەکە ، و رێکێ نەدە یـێن دیـتر کـارتێکرنێ ل تە بکەن یان باوەریێ بو تە چێکەن کو تـو مروڤـەکێ لاوازی و تـە چ شیان نینە و نەشێی چ کارەکی ئەنجام بدەی .

بلا هەردەم ل بیرا تـە بیـت ((الله)) خـودایێ تەیـە و تـو بەنـدەیێ وی ، و تو ل سەر ئەردێ وی خەلیفێ وی ، ئـەڤ چـەندە بەسـە تـو هەست ب هێزا خو بکەی .




ل دویڤ ئاراستیێ هەر کێشەیەکێ دگەل هزر و بۆچوونێن خەلکی نەبە ..

د بۆچوونا خودا یێ ب تنێ بە ، و هەردەم راستییێ بێژە ، هزر و بیرێن خەلکی نە د هەڤسەنگن .

نەهێلە ئەقلێ تە ژ وان بیت و دگەل وان بیت ، تو ب خو هەردەم ل سەر راستیێ بە .

❀•●●—☺ئارامبە☺—●●•❀

تۆ خۆ نابینی کا یێ ئەرێنی یان کەسەکێ نەرێنی

ئەگەر تە ڤیا بزانی کا تۆ ژ کیش لایەنی ؛ سەحکە کەسێن دەوروبەری خو و وێ ژینگەها تۆ تێدا دژی ، ئەو دێ بوتە دیارکەن کا تو ژ کیژ لایەنی؟

هەردەم گرنگیێ ب وێ چەندێ بدە دەوروبەری تە د ئەرێنی بن ، چونکی ئەڤ چەندە دێ بیتە ئەگەر کو تو بێی دل و دەستێن خو یێ ئەرێنی بی ، بەلێ ئەگەر ئەو د نەرێنی بن تۆ ژی هەروەسا بێی دل و دەستێن خو دێ یێ نەرێنی بی .

وەكی كاغەزەكا سپی سەرەدەریێ دگەل خەلكی بكە ، ئەگەر ئێك ژ وان خەلەتیەك كر ، خالەكا رەش ل سەر وێ كاغەزا سپی بدانە، و سەحكە ((بیاڤ و پارچا)) سپی ، دێ بینی ئەو هێشتا یا دروستە ، لەوما یێ بەردەوام بە و ژیانا خو دگەل دا ببورینە .

بەلێ ئەگەر گەلەك خەلەتی كرن و ژ سنوری دەركەفت ، دێ بینی بیاڤ و پارچا سپی یا خوّ ل كێمبوونێ ددەت ، و ل وێ گاڤێ یێ پشتراستبە دەم یێ هاتی تو بچی و وی كەسی بهێلی .

هشیاری دەربـرینێن نـە ئاشـکەرا و رووی ب رووی بـە ، چونکی ژ خرابترین شێوازێن سەرەدەریکرنێ یە ، دەمێ تو دبێـژی کەسـەکی ئەڤ کارە کر و یان ئەڤ ئاخفتنە گوت و کەسەك یـان هـەڤالێ تـە ب رەخ تە ڤە بیت ب وی رەنگی تۆ دێ گۆمانـا بـۆ وی چێکەی ، و ب ڤـی رەنگـی ئـەو کەسـێ ب رەخ تەڤـە دێ بزاڤـێ کـەت خـۆ ژ وێ دیـوانێ دویـر کـەت یـا هـوین گەهاندینـە ئێـك ب ئەگـەرێ وان ئاخفتنێن تە کرین ، دەمێ ئەو دویر کەفت دێ ب ئێکجاری ژ تـە دویرکەڤیت و جارەکا دی گوهداریا تە ناکەت .

۞••●——☺ئارامبه☺——●••۞

شیرەت بکە بەلێ پا شەرمێ لێ نەبە ..

وی کەسی ب شێوازەکێ جوان و رەوشتەکێ بلند شیرەت بکە ، و دەستێ وی بگرە داکو هەست بکەت تو یێ ژ حەژێکرنا خو شیرەتان لێ دکەی ؛ نە ژ کەرب و کینا خو ، و ل بەرامبەری خەلکی شەرمزاربکەی و ل دوماهیێ بێژی : ئەرێ ژ بەر چ من ئەو شیرەت د کر و ژ من تورەبوو ؟!

تە ئەو شیرەت نەکرییە ، بەلکو تە یێ شەرمزارکری و تورەیێ خو ژی ل بەرامبەری وی تە یێ کێم کری .



ئەگەر كەسەكی خەلەتییەك كر ئەو ب خو بێ بەرپرسە ، پێدڤی ناكەت كەسەكێ دیتر بكەیە ئەگەر ، یان بێژی : مالباتا وی ژی وەكو وینە ، یان مالا وی باش پەروەردە نەكریە ..

نوحی ((سلاڤ لێ بن)) ئیمان ب خودێ هەبوو بەلێ كورێ وی گۆهداریا بابێ خۆ نەكر و بێ ئەمریا خودێ كر .

و عەشیرەتا وی یان وەلاتێ وی نەكە ئەگەر ، چونكی هەر كەسەك ب خو ل روژا قیامەتێ ل سەر گونەه و خەلەتیێن خو بەرپرسە .

خودایێ مەزن ل رۆژا دووماهیێ پرسیارا خەلەتیا كەسێن دیتر ژ تە ناكەت ، و گشتیكرن زمانێ نەزانا یە .

خوشتفیێ تە ژ بەر دەستدانا تە نائێشیت و دلۆڤانییێ ب تە نابەت و دلێ وی ژ غیرەتا بەرامبەری تە هەی ناهێتە لێدان ؛ و ژبەر تە رۆندك ژ چاڤێن وی نابارن .

ژبلی وێ چەندێ وی تو وەك دایك و باب و خویشك و برا یێ هەژمارتی یا وەسا بە هەروەکی ئەو تە دبینیت ، ئەو تە وەکی خەلکێ خو و مالباتا خو دبینیت ...

د ڤێ قوناغێ دا دبێژنێ عەشقا هەتا هەتایی نەیا کێمە و خۆ ل زێدەبوونێ ددەت .



ئەو کەسێ دگەل ژنێ یێ توند بیت هەروەکی وی کەسی یە دگەل گولێ یێ توند بیت

و تۆ هەردەم دبینی ئەو کەسێ دگەل ژنێ یێ توندوتیژ بیت ل دەف زەلامی چ هەیبەت نینە ..

و دێ هەردەم بینی رەفتارێن وی وەکی رەفتارێن زارۆکانە چ جاران مەزن نابیت و چ جاران گەشە ناکەت ..

ب تنێ ل سەر ناسناما وی یا نڤێسای نێر و نابیتە زەلام .

❁•●●—☺ئارامبە☺—●●•❁

هشیاری پەیوەندییێن خوبە دگەل خەلکی ، یێ دوور چیکێن وی نە د مەترسیدارن ، ژ برینەکا ((مسافة)) دوور دهێن

بەلێ هندی یێ نێزیک بیت چیکێن وی گەلەک د مەترسیدارن ئەو ژ برینەکا نێزیک دهێن .




حەش کەسەکی نەکە ژبەر جوانیا وی چونکی دێ پیربیت

حـەش کەسێ نەکـە ژبـەر شـریناهیا پـەیڤێن وی چـونکی دێ ب تەڤە دەت

حەش کەسەکێ بێهنفرەھ بکە چونکی دێ دگەل تە راوەستیت ..

و حەش کەسەکی بکە کو د رەفتارێن وی د جوان بـن و یـێ ب دەڤ و ئەزمان بیت ؛ دێ شانازیێ پێ بەی ..

و حـەش کەسـەکی بکـە کـو حـەز ژ دینـێ خـو بکـەت چـونکی دێ دگەل تە راوەستیت و دێ شانازیێ پێبەی و دێ ب درێـژاھیا ژیـانێ یێ تەنابی ؛ ئەو نموونەکێ باشە .

☸•●●—☺ئارامبه☺—●●•☸

**گۆهداریا وی بکه یێ گازندا ژ ته دکەت ، دلێ وی یێ سپییه ، و چ تشتەکی ژ ته نافەشێریت ، و بزانه گازنده زمانێ خۆشتڤیانه .**

ئەگەر ل دەربارەی تە ئاخفتنەك یان تشتەك هاتە گوتن دهەمان دەمدا تە چ پەیوەندی پێڤە نەبیت بگرنژە .

پێغەمبەر ((سلاڤ لێ بن)) ل سەر رێکا خو دچوو ، دەمێ ل بەر خەلکی رادبووری دگوتنێ : ((بێ توشبوییە)) و ((شێت))ـــە ئەرێ پێغەمبەری چ دکر ... دایك و بابێن من گوری وی بن !؟ ئاخڤتن و تومەتێن وان ل ناڤ چاڤێن وان ددان و دچو !؟

خو نەئینە هەمبەر ئاستێ وان داکو بەرسڤا ئاخڤتنێن بێ بها بدەی ، چونکی تۆ مەزنتر و پلە بلندتری ژ ئاخڤتنێن وان ، وەلێ بکە سڤکاتیا وان بو وان بزڤریتە ڤە .

ب سانەهی تر .. ((تنێ بگرنژە)) .

هندەك جاران تە نەڤێت بو كەسەكی خەما خو دیاربكەی داكو ب ئەگەرێ خەما تە هەی ئەو ژی ب خەم نەكەڤیت .

بزاڤێ بكە هندی بشێی درویشم وسیماێن خەما ل سەر رویێ خو نەهێلە ، یان هەرە جهەكێ دویر و گەلەك هزرا خو بكە ، دوور هەرە .. بەلێ مـن دڤێت ب هزر و بێدەنگیا خو رموشا خو بگوهۆری و دلێ خو ڤالا بكەی ، و دەمێ تو دلێ خو بۆ خودێ ڤەدكەی ل وی دەمی دێ بینی هەروەكی خودێ دلەكی ل دلێ تە ددەت و یێ دبێژیتە تە :

ئەی بەندەیێ من ئارامبە ..

دگەل خودایێ جوان و مەزن هەست ب خوشیا ئاخفتنێ بكە ؛ ئەو كەسێ دەستێن خو بۆ وی بلند بكەت و دگەل باخفیت ب دەست ڤالا نازڤرینیت .

ئەگەر تە حەش کەسەکی کر و تە دیت شێوازێ سەرەدەریکرنا وی و گرنگی پێدانا وی دگەل تە یا کێم بووی و یا هاتیە گوهۆرین و وەکی بەرێ نەمایە ، و تە دیت ئەو یێ بزاڤێ دکەت ب هەر رەنگەکی خو ژ تە دویردکەت ، پێڤە نەمینە و ل سەر دویر کەفتنا وی ب خەم نەکەڤە ، چونکی خودێ ژبەر ئەگەرەکی یێ ژ تە دویر کری ، و ب ئانەهیا خودێ یا باشتر بو تە دڤێت . ب تنێ بلا تە باوەری ب خودێ هەبیت ، و یاسایا دووێ ب کاربینە کەرامەت و نەفسا تە بلا ل سەر هەر تشتەکی بیت .

و ل دووماهیێ ، یێ تو بڤێی ج پێنەڤێت دێ هەر بەرەڤ تەڤە هێت و خو نێزیکی تە کەت .. ((ب دوماهی هات)) .

کرپار و ئاخفتنێن مە گەلەکن یان بەلگەهن ل سەر راستیێ و خوراگریێ یان کلاڤ و درەون .

هەردەم یێ هشیاربە ل بەرامبەر وی کەسێ دئاخفیت و سەحکە کریارێن وی کا د گونجاینە یان نە ، چونکی گەلەك ژ خەلکی دبێژنە کەسەکی : ((ئەز حەش تەدکەم ، ئەز نەشێم بێی تە بژیم)) ل دەمەکی دێ بینی ئەو بێی تە یێ بەختەوەرە !

چ مفا د ئاخفتنێن خوش و شرین و هنگڤینی دا نینە ئەگەر کریارێن تە دگەل ئاخفتنێن تە نە دگونجای بن .

گەل ئەو هێزێن مەزنن ل سەر رویێ ڤی ئەردی ، و ب لێبورین ڤە دێ بینی هندەك گەلان ئاقلێ وان یێ ڤالایە و چ كارا ناكەن و پێشناكەڤن ، و د هەمان دەمدا دێ بینی هندەك گەل ب ئاقلێ خو یێ ژێهاتی كاردكەن و پێش دكەڤن و سەر ژنوی هەبوونێ و پەیداكرنێ ژ چونەییێ دروست دكەن .

خودایێ مەزن ئەم وەك گەل یێن چێكرین كو ئوممەتەكا ئێكانە بین و ل سەر ئەردێ وی ببینە خەلیفەیێن وی .

دا ببینە ئێك دەست ، ئەگەر مە سەركەفتن بڤێت ؛ دێ ب سانەهی هەمی تشتی زانین و دێ زانین كا دێ چەوا ب دروستاهی و سەركەفتی ژین ، چونكی ل سەر ڤی ئەردی ئەم ژ هەمی بونەوەران ب هێزترین .

❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

ئایین و نـــــەریتێن تە د دروستن ، ڤێجا ژبـــــەر چ تـو یێ ماندی و ڕكـــــوی ؟!




ئەگەر تو د رەوشەکا لاواز دابی و بێ سەرسامبی کو خەلك بێ زیانێ دگەهیننە تە ؛ بزانە و ژبیرنەکە ئەگەر شێر ژی کەفتە د تەنگافیەکێ دا یان تەلهەکێ دا هەتا مشك ژی دشێت زیچکەکێ بدانتێ ، بەلێ هێز و هەیبەتا تە هەرگاڤ دێ یا هەیی و ڤەمایی بیت ل وی دەمێ لاوازی ب دووماهیك دهێت .. ئارامبە .

**کیژ ژمه حەژێکرنێ ناکەت !؟**

((ئەم هەمی حـەژێکرنێ دکـەین)) ئیمانـدار و کافـــــر ، ژن و زەلام ، هەتا پێغەمبەرێ مە موحەممەد ((سلاڤ لێ بن)) حـەژێکرن یـا کـری ، دناڤبەرا وی و خەدیجایێ دا چیروکەکا مـەزن یـا حـەژێکرنێ یـا هـەی ، چیروکەکه ب ئاڤـا زێـری دهێتـه نڤێسان ، چونکی حـەژێکرنا وان یـا شـەرمەمەندانه و پاقـژ بـوو ، نـه وەکـی حـەژێکرنا خەلـەت یـا ڤـی سەردەمی بوو ((ب تنێ ئەو نـەبیت یـێ خودێ دلۆڤـانییێ پـێ دبـەت)) چونکی حەژێکرنا وان ل سەر بنەمایێ شەهوەتێ و تێرکرنـا حـەزێ ب تنێ یه ، و ب لەز ژ ناڤ دچیت و نامینیت .

ڤـێ یاسـایێ ژ مـن وەربگـره : ((یـێ حەشـتەبکەت ، ب بەرێخودانـەکا شـەهوانی نـا سـەحکەته تـه ، بـەلکو حەژێکرنـەکا شـەرمەمەندانه و عەشقەکا هەتا هەتایی دێ ژ ته بینیت)) .

گوتنێ ئەی ئیبراهیم ، ئەرێ تو ژ رۆژا قیامەتێ دترسی ؟

گوت : ئەرێ دترسم

و ل دەرباەری کەس و کارێن تە ؟

گوت : زەحمەت و تەنگافی و نەخوشییێن روژا قیامـەتێ دێ وان ژ بیرا من فەبەن .

هەتا گوتی : مووسـای ((سلاڤ لێ بـن)) دبێـژیت : ئـەز پرسیارا هەڤالێ خو هاروونی ژ تە ناکەم

عیسا ((سلاڤ لێ بن)) دبێژیت : ئەی خودا ئەز پرسـیارا مریـەما دایکا خو ژ تە ناکەم

ئیبراهیم ((سلاڤ لێ بن)) گـوت : ئـەی خـودا ئـەز پرسـیارا ئیسماعیلێ کوڕێ خو ژ تە ناکەم

هەروەکی خودایێ مەزن د قورئانا پیروز دا دبێژیت : ((لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ))

ئـانکو : ((روژا مـروڤ ژ ژن و زاروکێـت خـو درەڤیـت ئـەو ژن و عـەیالێ ددنیایێ دا هند حەژێدکر ، و ل سەر خاترا وان سینگێ خـو د ئێخستە هەمی نەخوشیان ، نەڤرۆ دێ ژێ رەڤیت))

ئـیللا یـێ خـودێ خـوڕاگرییێ ددەتـێ ئـەو ژی ب تنـێ پێغەمبـەرێ مە موحەمـەدە ((سـلاڤ لێ بـن)) خـودێ یـێ دیتـی و دگـەل فریشـتێ روحکێشانێ و هەروەسا ئاگر ژی یێ دیتی : ((عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا))

ئـانکو :((داکـو خـودێ مـەقامێ مـەحموودی بدەتـە تـە)) چ شاهەکێ نێزیك نینە ، و چ پێغەمبەرەکێ هنارتی نینـە ئـیللا دێ روژا قیامـەتێ دوعایا وی ئەڤە بیـت : ئـەی خـودا سـلامەتییێ بـدە ، سلامەتییێ بدە ،

ئیللا پێغەمبەرێ مە موحەمەد نەبیت ((سلاڤ لێ بن)) دێ بێژیت :

ئەی خودا ئوممەتا من ئوممەتا من .

ئەرێ چێدبیت ئەڤ پێغەمبەرە بهێتە هێلان !؟ ئەرێ دێ تو سوننەتا ڤی پێغەمبەری هێلی !؟

سلاڤ ل سەر سەروەرێ مە موحەمەدی بن .




بۆ کەسەکی دیارنەکە کو تۆ یێ راست و دروستی ، ئیللا ئەو نەبیت یێ تۆ حەژێدکەی .

بۆ وی دیاربکە ، ئەگەر گوهدێریا تە نەکەت و باوەر ژ تە نەکەت ((بهێلە)) یا دیتر تو نەیێ نەچاری کو ئەو ڤێ چەندێ و وێ چەندا هە بزانیت تو یێ ڕاستگویی ، ل سەر ئەنیا تە نەنڤێسایە تو یێ ((درەوینی)) .

یێ باوەر ژ تە بکەت دێ هەردەم دگەل تە بیت ..

و یێ باوەر ژ تە نەکـــەت دێ ب درێژاهییا سالان تە گەلەك مانـــدی کەت .



دێ ب ئانەهیا خودێ ژیەکێ درێژ بەی ، بەلێ بو وێ چەندێ نەژی دەرڤێ تەنگ ب دوماهیك بینی ، جیهان ل بەر سینگێ تە وەکی شانویەکێیە .

بزانە و کاربکە و بخوینە دا زێدەگاڤیێ د دیتن و سەر هلبونێن ژیانێ دا بکەی ، بۆ نموونە : بەری توشی هەلهژیانێ بی دڤێت بزانی چەوا دێ سەرەدەریێ دگەل کەی ، چونکی ئەگەر تە ل بەری هینگی زانی دێ هەمی هەلهژیانا سڤك کەی و ب دوماهیك ئینی .




پەشیمانی یا جوانه ، و بەلگەهە کو هێشتا ویژدانا تە یا ب سەلامەتە .

ئەگەر تو ل سەر خەلەتیەکێ پەشیمان بووی ئارامبە ، تۆ یێ ب سەلامەتی .

خودێ حەش وی بەندەی دکەت یێ دانپێدانێ ب گۆنەهـ و تاوانا خۆ بکەت .

یێ تە زیان گەهاندییێ داخازا لێبورینێ ژێ بکە دێ بیە قەهرەمان .

پێغەمبەر ((سلاڤ لێ بن)) ژ مە باشتر بوو بەلێ دهەمان دەمدا خۆ مەزن نەدکر ، بەلکو ئەو مەزنترین زەلام بوو د خۆ شکاندنێ دا و د هەر تشتەکی دا ، ب دایك و بابێن خوڤە گوری وی بم .

ببوورە و خۆ بشکێنە و یێ روح سڤك بە و خو مەزن نەکە ؛ بهێلە ویژدانا تە بژیت .

کەسو کارێن تە نیعمەتن خودێ دگەل تە کرین ، بەلکو ئەو ژ مەزنترین و باشترین نیعمەتا نە ، تو ئارامیا دروونی و تەناهیێ دروینشتن و ئاخفتنا دگەل وان دا دبینی .

د ڤێ ژیانێ دا گەلەك کەس پێن هەین مروڤێن خو پێن ژ دەست داین و هیڤیا دکەن دەم پشت و پشت بزڤریت داکو خوشیێ ب وان گاڤێن ژیانێ ببەن و دگەل وان روینە خار و ب ئاخڤن .

ئەو کەسێن بێ بەهر چەند هیڤیا ب دەستڤەئینانا نیعمەتا مروڤێن خو دکەن کو وان د ڤێ ژیانێ دا کەس و کار هەبن ، و هیڤیا وان ئەوە بزڤرن .

ئەگەر خەلکێ تە توندی دگەل تە بکارئینا ئەو حەشتە دکەن ، و بزانە توندییا وان ژبەر تەبوویە و د بەرژەوەندییا تەدا بوویە .

وێ هزرێ نەکە وان دوژمنداریا تە یا ڤییای ، بەلکو تەمام ب بەروڤاژی وێ چەندێ ، توندییا وان دگەل تە رامانا وێ چەندێ ددەت داکو بەرێ تە بدەنە رێکا راست و ل سەر بچی .

ئەو شیرەتکارێن مەزنن ب چ بهایەکی ناهێنە هەژمارتن ، یێ لێبوردەبە دگەل وان و وان قەبول بکە چونکی دەما ئەو دچن بەختەوەریا ژیانێ ژی دچیت .(٢)

(٢) ل ڤێرێ مەرەما نڤیسەری نە ئەوە تو قوربانیێ بو کەسەکێ نە ژ هەژی بدەی و رێکێ بدەی مافێ تە ژ لایێ زورداران بهێتە خارن و بێدەنگ بمینی ، داکو مروڤێن خو ژ دەست نەدەی ، بەلکو مەرەم ئەوە ب کورتر هەرە دناڤ بابەتان دا و باشتر هزرا خو تێدا بکە دا پەشیمان نەبی ، ب کورت و کورمانجی بهایێ هەر کەسەکی ب دروستاهی بزانە و ژبیرنەکە کا دێ چەوا سەرەدەریێ ب رەنگەکێ ئاقلمەندانە و دروست ل دویف فەرمانا خودێ و پێغەمبەرا دگەل کەی ..... وەرگێر

تام کە نەخوشییا دا فێربی و بزانی .
ئەڤ ژیانە قوتابخانەیە وانە و سەربۆران پێشکێشی مە دکەت .
ئەگەر کەسەکی زۆرداری ل تە کر سەرسام نەبە ، ئێکسەر حێبەتی نەبە .
ل دەستپێکێ تام کە نەخوشییا دا بزانی کا دێ ل دووماهیێ چ کەی .
چەند رۆژ و گاڤێن ب سانەهی نە ل وی دەمی دێ هەست پێکەی ڤێ دونیایێ چ بهایێ خۆ نینە .
بەلێ ب کوپراتی هزرا خۆ بکە خودێ یێ ل هنداڤ ، ل وی دەمی دێ یێ ئارامبی و دێ بێژی : خودا یێ دگەل وان کەسێن زۆرداری لێ دهێتە کرن و دگەل هەر دلەکێ هاتیە ئێشاندن و بریندارکرن .
دێ تیروشکێن گەش ددلێ خودا بینی ل دەمەکی حالێ تە یێ د تاریێ دا ، ب ئانەهیا خودێ هەر تشتەك ل دووماهیێ دێ بەرەڤ باشبوونێ چیت .
خودێ دبێژیت : ((فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا))
ئانکو: ((دگەل هەر بەتەنگیەکێ بەرفرەهیەك هەیە))

بێدەنگی یا جوانە ، و تێبینیا وێ چەندێ بکە ئەگەر تو بێدەنگ مای تشتەکێ جوان و نموونە دێ ل پێش چاڤێن خۆ بینی .

بو نموونە بێدەنگی د هزرکرنێ دا : هزر کرن د بونەوەرێن خودایێ مەزن دا

و هزرکرن مەزناهییە ، چێکرنا ئەرد و ئەسمانا بێ ستوین و چیا و دەریا هەمی ژ بەر جوانیا هزرکرنێ بێدەنگ دمینن ..

بێدەنگیێ گەلەك مفا پێن هەین .

بۆ نموونە : ئەگەر تۆ یێ تورەبی ل وی دەمی بێدەنگی باشترە تۆ پەیڤێن دلشکەستنێ و بریندار کرنێ ب کاربینی ، دەمێ تو بێدەنگیێ نەپارێزی چێدبیت سڤکاتیێ ب گەلەك کەسان بکەی ! و ل دوماهیێ دێ بێژی : خوزیکا ل وی دەمی من خۆ بێدەنگ کربا ..

بێدەنگی دەرگەهەکێ مەزنێ خێرێ یە ، پێغەمبەر ((سلاڤ لێ بن)) دبێژیت : ((قل خیرا أو اصمت))

ئانکو : ((ئاخفتنا خێرێ بێژە یان بێدەنگ بمینە))

ژ سەماکێ کورێ حەربی دهێتە ڤەگوهاستن دبێژیت : ((قلت لجابر بن سمرة : أكنت تجالس النبي صلى الله عليه وسلم ؟ قال : نعم ، كان طويل الصمت ، قليل الضحك ، وكان أصحابه ربما تناشدوا عنده الشعر والشيء من أمورهم ، فيضحكون ، وربما يبتسم))

.(( من گوتە جابرێ کورێ سەمرەی : ئەرێ تۆ چ جارا دگەل پێغەمبەری روینشتی ؟ گوت : بەلێ ، ئەو گەلەك یێ بێدەنگ بوو ، و کێم دکرە کەنی ، و ل وی دەمی هەڤالێن وی ل نك وی هۆزان دگۆتن و تشتەك دگۆت پێ ب وان ڤە گرێدای بیت ، وان دکرە کەنی و چێدبیت ل وی دەمی گرنژیبایە))

رواه أحمد والطبراني وصححه ابن تيمية وحسنه ابن هجر والألباني .

و هەروەسا ئبن بریدە دبێژیت : من ئبن عەبباس دیت زمانێ خۆ دگرت و دگوتێ : ((ويحك ، قل خيرا تغنم ، أو اسكت عن سوء تسلم ، وإلا فاعلم أنك ستندم))

ئانکو : ((خودێ مرنێ بدەتە تە ، تشتێ خێرێ بێژە دێ گەهیە حەقێ خۆ ، یان ب خرابی نە ئاخڤە دێ یێ ب سەلامەت بی ، یان ئیللا بزانە تۆ دێ پەشیمان بی)) .

زەلامەکی گوتە سەلمانی ((خودێ ژێ رازیبیت)) : شیرەتان ل من بکە

گوت : نەئاخڤە

وی زەلامی گوت : و چەوا دێ کەسەك شێت نە ئاخڤیت ؟ سەلمانی ((خودێ ژێ رازی بیت)) گوت : ئەگەر تە بهێنفرەهی ل سەر ئاخڤتنێ نەبیت ، نەئاخڤە ئیللا ئەو نەبیت یا خێر تێدا یان بێدەنگ بمینە))

رواه ابن ابي دنيا

دا پیچەك دگەل قورئانا پیرۆز ڤەمینین ل سەر جوانیا بێدەنگیێ راوەستین ...

زەکەریای ((سلاڤ لێ بن)) دگوتە خودێ : ((قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً))

ئانکو : ((زەکەریا گوت خودێ وو نیشانەکێ بدە من ئەز پێ بزنم کابانی یا من یا گرانەیە))

ئانکو : ((آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَ لَيَالٍ سَوِيًّا))

خودێ چ گوتە زەکەریای ((سلاڤ لێ بن)) ؟!

خودایێ مەزن گوتێ : ((خودێ گوت : نیشانا تە ئەڤەیە تۆ نەشێی سێ شەڤ و رۆژان ، و تۆ یێ دروست ، دگەل خەلکی باخڤی))

و دسورەتا (آل عمران) دا خودێ دبێژیت : ((قَالَ رَبِّ اجْعَل لِّي آيَةً قَالَ آيَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ النَّاسَ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمْزًا وَاذْكُر رَّبَّكَ كَثِيرًا وَسَبِّحْ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ))

ئانکو : ((زەکەریا گوت خودێ وو تشتەکی بو من بکە نیشان خودێ گوت نیشانا تە ئەوە سێ روژان تۆ نەشێی دگەل خەلکی ب ئاخفی ، ب ئیشارەتان نەبیت و گەلەك ناڤێ خودایێ خو بینە و گەلەك ب پەرێسە ، و سپێدە و ئێڤاران خودایێ خۆ ژ کێماسیان پاقژ بکە))

و ئەڤە بەلگەهە ل سەر وێ چەندێ ئەو بۆ ماوێ سێ شەڤ و روژان دگەل خەلکی نەئاخفتیە ، ئاخفتن ژێ قەدەغە کر بەلێ زکرێ خودێ پتر کر .

دا پتر و پتر هزرا خو بکەین ..

مە د زکرێن خودێ دا گەلەك کێماسی پێن هەین

ئەگەر تە خێر و بەرەکەت ژ رزقی و مالی و جهگەرا خو دیت و هەر تشتەکێ تە دلخۆش دکەت تە ب زکرێ خودێ ب دەستڤەئینابیت ، پتر زکرێ خودێ بکە و گەلەك پێ بێدەنگ بە ؛ چونکی باشترین دەرگەهێ خێرێ یە .

بزانە ئەگەر ل دەوروبەرێن تە خەلکەك هەبوون تۆ بەرەڤ پێش بری ، و د هەر کارەکی دا هاریکاریا تە کر دا سەرکەفتنێ ب دەستڤەبینی و خو پێشبێخی و ب هاریکارییا وان باشتر بی ، دێ پێ مەزن بی .

و ژ لایەکێ دیتر ، ئەگەر ل دەوروبەرێن تە ئاخفتن گوتنە تە و تو تێکدای و ب هەمی رێکەکێ دژاتیا تە کر و وەل تە کر کو تۆ ل جهێ خۆ ڤەمینی و سەرنەکەڤی و باشتر نەبی و بێژنە تە : تو تێرا خو نەیێ ب هێزی .. ب راستی ئەڤ جۆرێن خەلکی د خۆلیسەر و پاشڤەمایی نە .

ئەگەر ل دورماندورێن تە ئەڤ جۆرە کەسێن خۆلیسەر هەبوون ، د دەمەکێ کورت دا دێ وەکی وان خۆلیسەر بی ، لەوما دەنگێ د ناڤیا تە دا گەلەك یێ ب هێزە ؛ ب هێزا خو کەڤری د بژکینیت ..

وی تشتی بکە یێ تە دڤێت و وەسا بژی هەروەکی تە دڤێت ژبلی وی تشتێ خودێ حەرامکری ؛ لەزێ بکە وی تشتی ب دەستخوڤەبینە یێ تەدڤێت ڤێجا چ ژنوی تۆ خۆ فێربکەی یان هەتا ئەگەر تە بڤێت خو فێری تشتەکێ نوی ژی بکەی دەستپێبکە و دەستا نە داهێلە .

ل قوناغێن دەستپێکێ را دەستپێبکە دێ کار گەلەك یێ ب زەحمەت بیت بەلێ دەستا نەداهێلە گیانێ مرۆڤایەتیێ گەلەك ژ وێ چەندێ بهێزترە ژ وێ هزرا تو تێدا دکەی .

خو فێربکە ؛ ئەگەر فێربوون گەهشتە وی رادێ تە دڤێت دێ باشتر و باشتر بی ، و ب لەز دێ هەستپێکەی و زانی ئەوەسا یاب زەحمەت بوو هەروەکی مـن هزر بو دکری ، و ب ئانەهیا خودێ پتر ئەنجامێن

سەرکەفتنێ دێ بینی . هێزا خۆ یا مەزن یا د نافییا خۆدا بچینە ، بچینە و پتر گەشێ پێ بدە ..

خەلك نە د دروست و تێکدەرن ((ئەو نەبیت یێ خودێ دلۆڤانییێ پێ دبەت))

دێ بێژنە تە : نە ، نە ، نە .. و دێ وان تشتا بێژن یێن دبنە ئەگەرێ شکەستنا تە ، و کار و هیڤییا وان ژی ئەوە تاریستانەك د نافییا تەدا ژ دایك ببیت ، لەوما ل سەر وی کەسی زاڵبە یێ باوەر نەکەت تۆ یێ ب هێزی .

ئەگەر تۆ بلند بووى دێ خەلك دەستا بوتە فوتن !؟

د سەرپێدا نەچە ، دەمێ تۆ بلند دبی هەتا شەیتان ژی بۆتە دەستان دقوتیت ، ئەگەر تە هەر کارەك ئەنجامدا یێ ئەو حەزێدکەت ، دێ دەستا بوتە قوتیت

ئەگەر تو یێ بەختەوەر و ئارام بی دێ دەستا بوتە قوتن ..

و هەڤالێ راست و دروست !؟

هەڤالێ راست و دروست ئەوە یێ دگەل تە رادوەستیت ئەگەر تو ب کەڤی ژی ... نە ئیللا تۆ بلند ببی ، دێ دگەل تە رادوەستیت ئەگەر هەمی کەسێن دیتر تە بهێلن ژی .

هەڤالێ راست و دروست بێی ئەگەر و بێ مەرج حەشتە دکەت ، و ب ئەگەرێ هەبوونا تە ؛ پێدڤی ب هەڤالێن نوی نابیت .

ئەو ب تەمامی یێ ژتە رازییە و تۆ ژی ب تەمامی یێ ژ وی رازی .

چێدبیت ئەو کەس یان ئەو هەڤال ب رەخ تەڤە بیت دەمێ تۆ ڤان پەیڤێن من دخوینی ، و دگەل وێ چەندێ تە گەلەك هەڤال ژی یێن هەین ، بەلێ ل ڤێرێ کەسەکێ ب تنێ یێ'هاتی دگەل تە بمینیت ..

بزانە ئەڤ کەسێ هاتی دگەل تە بمینیت ب راستی ئەو زری ((درع))یێ تەیە .. لەوما بپارێزە .

کی باشترین مۆسلمانه ؟ دایکا فیرعەونی؟!

دێ ڤـێ پرسـیارێ کـەی و ب سەرسـامی راوەسـتی ؟ چـونکی ب چ رەنگەکی چ روی بۆ هەڤبەرکرنێ نینە ، مۆسلمان دبێژیت : ((الله محمد رسول الله)) ، و فیرعەونی دگوت : ئەز خودایێ هەوە یێ بلندم .

خودایێ مەزن گوتە موسای : ((اذْهَبَا إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى (٤٣) فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَيِّنًا))

ئانکو : ((هوین هەردوو هەرنە نك فیرعەونی ، ب راستی ئەو زێدە یێ سەرداچوویی ڤێجا ب ئاخفتنـەکا نـەرم دگـەل ب ئـاخڤن)) هـزرا خـۆ د دوو پەیڤێن دوماهیێ د ڤێ ئایـەتێ دا بکـە ، چ جورە سـەرەدەرییەکە ئەگەر مۆسلمانەك بێژیت : ((لا الـه الا الله محمـد رسـول الله)) و دهـەمان دەمدا گۆنەهـەکێ بکـەت ل شوونا دیارکرن و نیشادانا خۆشـڤیانا خـو دایـێ مـەزن و دلوڤـان وەلێ بکـەت بـەرەڤ خـودێ بزڤریـت ، بهێتـە ترساندن ، ب پەیڤێن جوان شیرەت بکـە ؛ نـە ب ترسـێ و توقانـدنێ ، چونکی ئەگەر تە بیرا وی ژ دلۆڤانیا خودێ ئینا دێ ب ترس و هیڤی و شکەستی بەرەڤ خودێ زڤریت ؛ ژبەرکو ب تنێ تە ب جوانی یێ دگـەل ئـاخڤتی ، لـەوما خـودێ بـیرا وان مـرۆڤێن بـێ ئـەمرییا وی دکـەن ژ دلۆڤانیا خۆ یا ئینای هەروەکی دبێژیت : ((قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَى أَنْفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللهِ))

ئـانکو : ((ئـەی موحەممـەد تـۆ ب نـاڤێ خـودایێ خـۆ بێـژە وان هـەی بەندەیێت من ، هەی ئەوێت هـەوە زێـدە گونـەهـ کرین و هـەوە دکرنـا گۆنەهان دا ، دایە سەر هـەمی تخوبیـان ، ژ دلۆڤانیـا خـودێ بـێ هیڤـی نەبن))

خودێ بیرا بەندەیێن خۆ یێن نەگوهدار و گونەهکار ژ دلۆڤانیا خۆدئینیت ، ئەرێ پا ژبەر چ تو بەندەیێن خودێ دترسینی ل شوونا بیرا وان ل حەژێکرنا خودێ بینی ؟

چ پێنەڤێت خودایێ مەزن د سزادانێ دا سزادەرەکێ توندە ، بەلێ بزانە دلۆڤانیا خودێ ژی یا بەری تورەبوونا وی کەتی .. ئارامبە ، و خو نێزیکی خودایێ دلۆڤان بکە ...



تۆ پێ سپی ؟ شانازیێ ب رەنگێ خو ببە

جوانترین بونەوەر خودێ دای ل سەر روویێ ئەردی یووسف بوو ((سلاڤ لێ بن)) رەنگێ وی پێ سپی بوو ، شانازیێ ب رەنگێ خۆ ببە تۆ پێ جوانی ..

ئەگەر تۆ پێ ئەسمەر بی ؟ شانازیێ ب رەنگێ خۆ ببە چونکی مووسا ژی ((سلاڤ لێ بن)) پێ ئەسمەر بوو ..

شانازیێ ب رەنگێ خۆببە رەنگێ تە پێ سەرنجراکێش و جوانە ، و ئەگەر تۆنە گەلەك پێ سپی بی و نە پێ ئەسمەر بی ؟ شانازیێ ب رەنگێ خۆ ببە چونکی پێغەمبەرێ مە موحەممەد ((سلاڤ لێ بن)) سەروەرێ کورێ ئادەمی نەگەلەك پێ سپی بوو و نە پێ ئەسمەر بوو ..

شانازیێ ب رەنگێ خۆ ببە رەنگێ تە رەنـــــــگێ شاهانەیە ..

شانازیێ ب رەنگێن خۆ ببەن ، هەر رەنگەکی سەروەرەکێ مەزن پێ هەی .

هندەك وسا تێدگەهن هێزا کەسایەتییێ ئەوە دەمێ تۆ تورە دبی و خۆ تووشی هەلچوونێ بکەی ، ب بەرۆڤاژی ئەڤێ چەندە پتر دوژمنا پەیدا دکەت ل شوونا تۆ ل نك خەلکی یێ خۆشتڤی بی ، هێزا کەسایەتییێ یا رێزگرتنا تەدا ل هەمبەر خەلکی ، ئەگەر خەلەتیەك د راستا تەدا کر هێزا تە یا کەساتی یا د وێ چەندێ دا بەرسڤ نەدەی و رێزا خو کێم نەکەی ، ب ڤی رەنگی کەرامەتا تە یا بلند دێ خو ل کێمبوونێ دەت ، چونکی تە بەرسڤا وی یا دای ئەو ژی هەر ب وێ رێکێ و ب وی شێواز و رەوشتێ کێم دێ سەرەدەرییێ دگەل تە کەت ، بێدەنگ بمینە رەوشتێ تە رێکێ نادەت تۆ بێ بها ببی ، چونکی ئەو یێ بێ بهایە .



هەردەم یێ گەشبین بە بۆ نموونە :

ئەگەر تە شکەستن ئینا بێژە : ب ئانەهیا خودێ بۆ جارا بهێت دێ ب سەرکەڤم .

ئەگەر ب خەم کەتـــــی بێژە : ب ئانەهیا خودێ ؛ دێ دلخوشبم و ئەز بهێزترم .

ئەگەر کەسەکی تۆ هێلای بێژە : خێرەکە ژلایێ خودایێ خەلکی ڤە ، وی کەسی ئەز ژ خودێ دویر دکرم ، لەوما خودێ بەلا وی ژ من ڤەکر

ئەگەر تۆ نەگەهشتیە ئارمانجا خۆ ، بێژە : ب ئانەهییا خودێ بۆ جارا بهێت دێ گەهمێ و ئەز ب چ رەنگەکی دەستا نا داهێلم .

و ب ڤی رەنگی ووزە د دەروونێ تەدا پەیدا دبیت ، و ئەقلێ تە یێ فەشارتی ڤان هەمی پەیڤان وەردگریت و هەلدگریت و ب ئانەهییا خودێ گەلەك مفای دێ گەهیننە تە ، و پێغەمبەری ((سلاڤ لێ بن)) حەز ژ گەشبینیێ و ئاخفتنا خێرێ دکر و ب سانەهی دئێخست و پێڤیا خۆ د ڤەتاند ؛ دەمێ گوهـ ل کەسەکی بایە کو یێ دبێژیت : ئەی خودان شیان ، یان ئەی سەرکەفتی ، ب وێ چەندێ دلخوش دبوو ، یان ئەگەر کەسەك یێ نەساخ گوتبا : ئەی پارێزێ ژ دەردو ئێشا ، ئەی ساخکەر ، یان تشتەکێ ب وی رەنگی ، دا پێ دلخۆش بیت .

لەوما یێ گەشبین بە و نەیێ رەشبین بە .




**ئەرێ تۆ دزانی تنێبوونێ گەلەك مفایێن مەزن یێن هەین !؟**

**دگەل دەردو نەخوشییێن وێ هندەك جاران گەلەك یا باشە .. ئەرێ تۆ دزانی بۆ چ ؟**

**چونكی ب تنێبوون دێ تە گەهینتە خودێ و دێ ئیمانا تە پتر لێكەت و د خوشی و نەخوشییێن خودا دێ ب ویڤە هێیە گرێدان ، هەردەم د تنێبوونا خۆ دا دگەل خودێ بە .**



هەر كەسێ تو حەژێدكەی حەژێكرنا خو بو رابگەهینە داكو نەچیت و ژ دەست نەدەی ، دێ پەشیمان بی چونكی تە نە گوتیێ ، فێجا بێدەنگ نەمینە .

ئەگەر پێغەمبەری ((سلاڤ لێ بن)) حەش كەسەكی كربا دا دانپێدانێ كەت ، هەروەكی گوتیە موعازی : ((يا معاذ ، والله إني لأحبك ، والله إني لأحبك))

ئانكو : ((ئەی موعاز ، ب خودێ ئەز حەشتە دكەم ، ب خودێ ئەز حەشتە دكەم))

رواه ابن داوود .



☸•●●—☺ئارامبە☺—●●•☸

داخازیەکا ب سانەهی ، سلاڤکە سەر خۆشتڤیێ خۆ ((محمد))ی ((سلاڤ لێ بن))

**۞•●●—☺ئارامبە☺—●●•۞**

**گرێنترین کەس ئەوە یێ خالا لاوازیا تە ب کاردئینیت ، وهەروەکی وی دڤێت تە ب کاربینیت .**

**بزانە خودایێ مەزن دێ د گەل وی کەت یا وی د گەل تە کری ب تنێ بێهنا خۆ فرەهـ بکە و سەحکێ کا دێ چەوا بو خەلکی بیتە ئامیرەکێ ب پێکەنین .**

۞•●●—☺ئارامبه☺—●●•۞

د حەژێکرنێ دا گریێ دوو رووی یێن هەین :

رویێ ئێکێ : شرۆڤەکرنا وێ غەریبی و پێدڤی بوونە .

رویێ دووێ : شرۆڤەکرنا وێ شکەستن و هلهژیانە ..

هشیاری رویێ دووێ بە ؛ چێدبیت بچیت و ژدەست بدەی .




دونیا یا سادەیە و تو دشێی خەلکی ب رەوشتێ خو سادە بکەی ، ئەو کەسێ رەوشتەکێ نەجوان و خراب هەی ؛ رەوشتێ تە دێ دەتە دیارکرن و خو بێدەنگ کەت .

رەوشتێ تە چەکەکێ ب هێزە ، پەیڤ گەلەك مالان خراب دکەت ، و پتر مالا ئاڤا دکەت ، بو نموونە : پەیڤا ((حەشتە دکەم)) گەلەك دلان ب دەستڤە دئینیت ، لەوما یێ رەوشتەکێ باش هەبیت هەرجار د هەر تشتەکی دا سەردکەڤیت .

☺☺●●●—☺ئارامبە☺—●●●☺

ترس هەڤاڵ تە بێ شیرەتکەرە .

خەلەتیێن تە نیشا تە ددەت داکو دووبارە نەکەیەڤە ، و مفای ژێ وەربگری .



❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

ئەگەر تە کەسەك خاپاند وێ هزرێ نەکە ئەو یێ بێ ئاگەهە و یێ گێژ و خەشیمە ، بەلکۆ وی گەلەك باوەری یا دایە تە .




هندەك جاران تۆ دێ هەر تشتەكی كەی داكو خەلك مەدحێن تە بكەن ، چونكی دناڤیا تەدا ڤالاییەك یاهەی تە دڤێت ڤی تشتی و وێ هە بكەی داكو خەلك مەدحێن تە بكەن ، و ئەڤە ژی تشتەكێ ب زەحمەتە ، و چارەسەری ژی ئەوە تە باوەری ب خۆ هەبیت بۆ نموونە : ئەگەر وێنێ تە تو سەرسام كری ل هیڤیێ نەبە خەلك بێژنە تە : تۆ یێ جوانی ، چونكی تۆ یێ ژجوانیا خۆ رازی ، چ مەدح و ستایش پێنەڤێن چونكی تە ب خۆ ستایشێ خۆ یێ كری ، و تە ب خۆ یێ خو پشتراست كری كو تۆ یێ جوانی .

😘•●●—☺ئارامبە☺—●●•😘

ئەرێ تە هەڤالەکێ باش و بەرکەفتی هەیە !

چێدبیت بچیت

بەلێ چ پێنەڤێت دێ هەر زڤریتەڤە !

ئەو هیڤی یە ، و چ جار ژ تە خائین نابیت .

## ئارامبە

ئەگەر تۆ کەتییە د گونەهەکێ دا نەبێژە کەسێ

خودێ گەلەك دیارییەکا پر بها یا پێشکێشی تە کری ، بهایێ وێ ناهێتە زانین چەندە ئەو ژی پاراستنە .

خودێ دبوریت و ژێدبەت ، و خەلك دچن و شەرما مروڤی دبەن ((ڤێجا ئەو نەبیت یێ خودێ دلۆڤانییێ پێ د بەت)) .



❂•●●——☺ئارامبە☺——●●•❂

**د حەژێکرنێ دا تشتەك وەکی بەرێ ئازڤریتەڤە**

**باش تەکەزێ دپەیڤێن من دا بکە ، و باش بخوینە ،**

**داکو دلێ وی کەسی نەشکێنی یێ حەشتە دکەت .**

⚙•●●—☺ئارامبە☺—●●•⚙

بزانه من حەزەکا مەزن یا هەی خو بگەهینمەتە ..

بەلێ رەتکرنا تە یا سار من دسوژیت ((وی تشتیێ ل نـك مـن گـەرم بکە دێ وی تشتیێ ل نك تە سارکەم))

و بزانه رەتکرنێن تەنە وەل من دکەن ئەز بچم .



❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

ل ڤێرێ خەون یێن هەین مە دڤێن بجه بهێن ، و راستی ژی یێن هەین ئەم هیڤی دکەین خەون بانە ، لەزێ د خەونێن خــوَ دا نەکە .




ل هندەك دەمان دێ بینی هەمی كەسێن دەوروبەرێ تە پتر ژ وی كەسێ تە خوش دڤێت گرنگیێ ب تە ددەن ، ل دەمەكی دا دێ بینی ئەو چ گرنگیێ ب تە نادەت ، چەند هەستەكێ نەخۆشە .

و ئەم دگەل گەلەك ژ خەلكی دروینینە خار بەلێ هەست ب بەختەوەریێ ناكەین ، بەلكو هەست ب تنێبوونێ دكەین ، بەروڤاژی وی كەسێ تۆ حە ژێدكەی ئەو ب تنێ هەمبەری هەمی خەلكێن سەر روییێ ئەردی یە .

❂•●●—☺ئارامبه☺—●●•❂

هندەك ژ خەلكی د نێرینا خودا تە باشترین كەس دبینن ..

و هندەك ژ خەلكی د نێرینا خودا تە ب چنە دبینن ..

خودایێ مەزن تۆ نە چێكری داكو د نێرینا ئەڤێ هەنێ و یێ دی دا تشتەك بی یان چ نەبی ..

خودێ تۆ یێ چێكری داكو د دیتنا وی دا بەندەیەكێ چاك بی .

۞•●●—☺ئارامبە☺—●●•۞

تۆ نزانی باشی و قەنجیێن وی کەسێ د ژیانا تەدا دەرکەفتی چەندن ، روژەکێ ژ روژان دلێ خۆ بێ پێشکێشی تەکری ..

⊛•●●——☺ئارامبه☺——●●•⊛

**هەردەم ژ وی تشتی رازیبە یێ تە هەی ، نە ژ وی تشتێ تە نەبیت ..**

**هەر تشتەکێ تە هەی ژ پێشکێشکرن و کەرەمێن خودێ نە ..**

**و هەر تشتەکێ تە نەبیت ژ قەدەرا خودێ و حیکمەتا وییە ..**

۞•●●▬☺ئارامبه☺▬●●•۞

حەژێکرن چەکەکێ ب دوو سەرە ، دشێت ژیانێ پێشکێشی تە بکەت ، و ل هەر دەمەکێ هەبیت تە ب کوژیت .




بگرنـزە و بکـە کـەنی کـەس بهـایێ بەختـەوەریا تـە ژ تـە ناوەرگریـت مادەم تۆ وی تشتی دکەی یێ تە دڤێت ؛ بێی زیانێ بگەهینیـە کەسێن دیتر .

۞•●●—☺ئارامبه☺—●●•۞

ڕەشبینی کابیسەك کرێت و ب ترسە ، دلخوشییا تە ژتە ددزیت و خەما بو تە دئینیت و وەل تە دکەت کو تە چ تشتەك نەڤێت ؛ ژبلی وێ چەندێ کو نەبیە چ !

❂•●●—☺ئارامبه☺—●●•❂

مەزنرتین هەڤالینی ئەوە مروڤ هەڤالێ خو بیت .

ئەرێ ما نە هەر وەکی تە دڤێت ..

هەرە هەروەکی تو حەز دکەی تشتێ تە ڤییا بخو و ڤەبخو ، چونکی ژبلی تە کەسەك نـــــەیێ ژ هـــــەژی وێ گرنگی پـــــێدانێیە .. ب کورتی ((خۆ نازداربکە)) ..

۞•●●——☺ئارامبە☺——●●•۞

دلێ تەیە هەمی جوانییێ دبینیت نە چاڤێن تەنە .

دەمێ خەونا دبینین ئەم چاڤێن خو دگرین .

دەمێ دکەینە گری چاڤێن خۆ دگرین .

دەمێ دچینە باوەشا ئێک چاڤێن خو دگرین .

دەمێ هیڤیا دکەین چاڤێن خو دگرین .

هەمی جوانی ئەوە تنێ تۆ هەست ب دلێ خو بکەی .

خودایێ مـــــەزن دقورئانــــێ دا ب رەتكرنــێ و نـــەهی یــێ بەحسی خەمبارییێ كری ....

ئەرێ تۆ دزانی بۆ چ !؟

خودایێ مەزن دبێژیت : ((وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا))

ئانكو : ((و هوین گەلی خودان باوەران سست نەبن و بخەم نەكەڤن))

خودایێ مەزن دبێژیت : ((فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ))

ئانكو : ((نە ترس بو هەیە و نەژی ب خەم دكەڤن))

و شەیتانی دڤێت بەندەیێ مۆسلمان ب خەم بكـەڤیت و ئەڤەیە هیڤیا وی ، نە ب تنێ دنابینی دا ، بەلكو دهەر تشتەكێ د ژیانـا وی یـا دینـی و دنیـایێ دا ، و پێغەمـــــبەری ((سـلاڤ لێ بـن)) یــێ خـۆ ب خـودێ پاراستی .

یا ب خەم ئـەوە ، پێغەمبـەری ((سـلاڤ لێ بـن)) یـێ گـوتی : ((اللهـم إني أعوذ بك من الهم والحزن))

ئـانكو : ((ئـەی خـودا ئـەز خـو ب تـە د پـارێزم ژ خــەمبارییێ و دلتەنگییێ))

رواه البخاري

و هەروەسـا ئـبن قـەییم ((خـودێ دلۆڤـانییێ پـێ ببـەت)) دبیـژیت : ((الحزن يضعف القلب ويوهن العـزم ولإرادة ولا شيء أحـب للشـيطان مـن أن يحزن العبد المؤمن))

ئانكو : ((خەم دلی لاواز دكەت و حەزێ لاواز دكـەت و شـەیتان حـەز ژ چ تشتەكی ناكـەت هنـدی وێ چـەندێ دەمـێ بەندەیـەكێ مۆسـلمان ب خەم دكەڤیت)) .

تـۆ دێ پرسـيار کـەی و بێـژی : دێ هـەر رۆژێـن خـەمبارییێ هـێن و زڤرنەڤە ، و ئەز یێ دگەل هزرا تەدا چونکی تـۆ یـێ د دونیـاییێ دا ، و بۆچی دبێژنێ دونیا چونکی یا بێخێرە ..

خـودایێ مـەزن و خـودان جەلالـەت دبێـژیت : ((لَا تَحْـزَنْ إِنَّ اللهَ مَعَنَـا))

ئانکو : ((ب خەم نەکەڤە هندیکە خودایە یێ دگەل مە))

باش ل سەر ئایەتێ بمینە و هزر تێدا بکە

ئەرێ تۆ چارەسەرییێ دبینی ؟

ئەگەر تۆ دگەل خودێ بی ناترسی .

ئەگەر تۆ یێ ژ خودێ پشتراست بی نەترسە .

دگەل خـودێ بمینـە دێ دگـەل تـە بیـت و دێ خـەما تـە گوهریـت بـو بەختەوەرییا هەتا هەتا یی .

دەریایێ مووسا نە خەندقاند ((سلاڤ لێ بن)) .

ئاگری ئیبراهیم نە سووت ((سلاڤ لێ بن)) .

نەهنگی یوونس نەخار ((سلاڤ لێ بن)) .

کێرێ ئیسماعیل نەکوشت ((سلاڤ لێ بن)) .

و بێ باوەران دڤیا موحەممەدی بکوژن ((سلاڤ لێ بن)) نەهاتە کوشتن

و براێن یووسفی دڤیا یووسفی بکوژن ((سلاڤ لێ بن)) نەهاتە کوشتن

، و دا بەن فرۆشن کو ببیتە بەندە بەلێ ببو شاه ..

فێلبازییێن مرۆڤان هەردەم شکەستنێ دئینن ، ئارامـــــــبە .

ئیرادا خودێ و رێڤەبرنا وی یا ل سەر هەمیان زاڵە ، خودێ دبێژیت :

((قُلْ لَنْ يُصِيبَنَا إِلَّا مَا كَتَبَ اللهُ لَنَا))

ئانکو : ((بێژە ب راستی چ بەلا و ئاتاڤ مە ناهنگڤن ، ئەو نەبن یێت خودێ بۆ مە نڤێسین))

❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

بزانه حەژێکرن ل ڤی سەردەمی دا یا ب دەگمەنە ..

و هەروەسا بزانه هەڤالینیا ب دروستاهی دەگمەنترە .

هیڤی دکەم بێژە دلێ خۆ یێ هشیاربیت .

د ئیسلامێ دا گەلەك وێنەیێن روحی یێن ژیانێ د قورئانا پیرۆز دا هەنە ، ڤێجا ئایەتێن وێ ب هێز ل سەر بابەتەکێ پەیوەندیدار هەلدە ، گەلەك یاباشە ... بەندەی دگەهینیتە خودێ ئەوژی حەژێکرن و ڤیانا خودێیە د پەرتووکا وی دا ((قورئانا پیروز)) هەتا هەشتێ جاران پەیڤا حەژێکرنێ و پێکهاتەیێن وێ یا هاتی .

ئەڤ ئایەتە ل سەر حەژێکرنا خودێ بۆ بەندەیێن وی و حەژێکرنا وان یێن هاتین ، هزربکە ئەگەر تۆ نامەیەکێ بۆ کەسەکی ب هنێری کو تە ئەو هەشتێ و چار جاران خۆش دڤێت ؛ بۆ خودێ هەردەم نموونەیا ژ هەمیا بلندترە ، ئەرێ دێ چ بەرسڤ دەت ؟

دێ زانیت تە دڤێت پێڤە بهێیە گرێدان و دڤێت ڤێ هەستێ دگەل تە بگوهریت ...

ئەرێ پا چەوا ئەگەر خودایێ مەزن دگەل مە ب ئاخڤیت و پەیڤێن حەژێکرنێ بۆ مە ب هنێریت دا پێڤە بهێینە گرێـــــدان ... خـــودا بێ جوانە .

❀•●●—☺ئارامبه☺—●●•❀

بلا پەیڤێن جوان بێن کەسەکێ نەنیاس تە نەخاپینن ..

چونکی تو نزانی کا چ ددلێ وی دایە .

خودایێ مەزن دبێژیت : (( وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيُشْهِدُ اللهَ عَلَى مَا فِي قَلْبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ))

ئانکو : ((ژ مروڤان هندەك هەنە ئاخفتنا وان ددونیایێ دا گەلەك یا ب دلێ تەیە ، و خودێ دکەتە شاهد ل سەر یا ددلێ خودا ، و ئەو ب خو دژوارترین دوژمنن)) .

☸••●—☺ئارامبە☺—●••☸

نەبیٚ دوو روی مە و نەییٚ نموونە مە و نەییٚ ب هەڤڵژم .

شیرەتا من بۆ تە ئەوە تۆ ژ من باشتربی ، خـــــودایێ مەزن هێز یادایە تە ؛ داکو بگەهییە جهێ خۆ ل فیردەوسێ .

شیرەتا من بو تە حەژێکرنە ، نە د سەلمینم ئەز ژ هەمیان باشترم .

❁•●●—☺ئارامبە☺—●●•❁

نە ئاخڤە و نەبێژە من کو تە ئەز دڤێم ، بهێلە دا کریارێن تە ببینم و دا بزانم تۆ حەش من دکەی ، حەژێکرن ب کریارایە نە ب گوتنایە .



هیڤیە ...

باوەڕیێ بۆ من چێنەکە کەسەك ب هەر ئەگەرەکێ هەبیت د ژیانا تەدا پێ دەرکەفتی ؟

چونکی حەژێکرن ل وی دەمی دیاردبیت گاڤا تە هزار ئەگەر هەبن بچی بەلێ تۆ بمینی و نەچی .

❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

بەرێخودانا لەشێ ئافرەتان

و بەرێخودانا لەشێ زەلامان

نە بەلگەهە ل سەر حەژێکرنێ ؛ بەلکو ب تنێ بەلگەهە ل سەر سەرنجراکێشیێ

یێ حەشتە بکەت دێ ژ بەر تە ژ خودێ ترسیت .

ژنا د فەسدینن و پشتی هینگی د پاشەروژا ژیانا خۆ دا ل هەفژینێن چاك دگەریێن ، و ب زەلاما سەرسام دبن و پشتی هینگی دبێژن : ئەی خۆ دا هەفژینەکێ چاك ب رزقێ مە بکە !

بزانە ئەی رێزدارێ من .. و بزانە ئەی رێزدارا من ..

ئەگەر هوین نە دچاك بن خۆ ماندی نەکەن داکو خودێ هەفژینەکا چاك یان هەفژینەکێ چاك ب رزقێ هەوە بکەت ..

ئەڤە سۆزا خودێ یە .

خودێ دبێژیت : ((الْخَبِيثَاتُ لِلْخَبِيثِينَ وَالْخَبِيثُونَ لِلْخَبِيثَاتِ وَالطَّيِّبَاتُ لِلطَّيِّبِينَ وَالطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَاتِ))

ئانکو : ((و ژنێت دهەمەن پیس بو زەلامێت دهەمەن پیس ، و زەلامێت دهەمەن پیس بۆ ژنێت دهەمەن پیس ، و ژنێت پاك و دهەمەن پاقژ بۆ زەلامێت پاك و دهەمەن پاقژن و زەلامێت پاك و دهەمەن پاقژ بۆ ژنێت پاك و دهەمەن پاقژن))

تە زانی ؟

❂••●—☺ئارامبه☺—●••❂

ئەگەر ئەو ئافرەتا حەشتەدكەت گوت : هەرە .....

نەچە

چونكى ئەگەر تۆ چووى ، بزانە دێ هەردوو چاڤێن خۆ ئینتە دەر .

نهێنی و کریارێن خۆ ڤەشێرە داکو بەختەوەربی .

ژ وان ئەگەرێن بەختەوەریێ هەروەکی پێغەمبەری ((سلاڤ لێ بن)) د حەدیسا خۆ دا گوتی : ((أربع من السعادة : المرأة الصالحة ، والمسكن الواسع ، والجار الصالح ، والمركب الهنيء))

ئانکو : ((چار تشت ژ بەختەوەرییێ نە : هەڤژینەکا باش ، و خانیەکێ بەرفرەه و مەزن ، و جیرانێ چاك ، و ترومبێلەکا خوش)) .

و ژ ئەگەرێن نە بەختەوەریێ و ماندیبوونێ هەروەکی پێغەمبەری ((سلاڤ لێ بن)) گوتی : ((وأربع من الشقاء : المرأة السوء ، والجار السوء ، والمركب السوء ، والمسكن الضيق))

ئانکو : ((و چار تشت مروڤی شەقی دکەن : ژنکا خراب ، و جیرانێ خراب ، وترومبێلەکا نەخوش ، و خانیەکێ تەنگ و نەخوش))

رواه ابن حبان في صحيحه والحاكم

(١) ((راستە ل سەر دەمێ پێغەمبەری ((سلاڤ لێ بن)) ترومبێل نەبوون ، بەلکو هەسپ و ماهین و حێشتر و گیانەوەرێن دیتر بو سیار بوونێ دهاتنە ب کارئینان؛ بەلێ نوکە ترومبێلێ جهێ وان یێ ڤەگرتی هەر چەندە هەتا نوکە ژی ئەو گیانەوەرێن باری هەر د خزمەتا مروڤان دانە و خودێ بو کاری یێن داین و گەلەك هەتا نوکە ب کاردئینن ، ئانکو پەیڤا ((مرکب)) بو هەر تشتەکی دهێتە ب کارئینان یێ مروڤ لێ سیار دبیت)) – وەرگێر

قورئانا پیرۆز نە ب تنێ چارەسەرییا نەخوشیا دەروونییە ، بەلکو چارەسەرییە بۆ هەمی نەساخیان : وەکی پەنجەشێری و دل و نەساخیێن پشتێ و پێن دیتر ، و هەر تشتێ پەیوەندی ب نەساخیێن دەروونی و نۆژداری هەبیت پەیڤێن خودێ چارەسەر دکەن ، خودێ دبێژیت : ((وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤْمِنِينَ))

ئانکو : ((و ژ ئایەتێن قورئانا مەزن ئەم وێ دئینینە خوارێ یا دەرمان بۆ دلان ژ نەخوشیان تێدا هەی ، وەکی شولا گومانێ و نیفاقێ و نەزانینێ ، و ئەم وێ دئیننە خوارێ یا دەرمانێ لەشان ژی تێدا هەی ب رێکا پێڤە خاندنێ و تشتێ دبیتە ئەگەرێ ب دەستڤەئینانا دلوڤانیا خودێ ژ بەر وێ باوەریا تێدا))

هەڤالەکێ من گوت برایێ وی یی توشی نەساخیا پەنجەشێرێ بووی ، ئەو ب دەرمانا دژیت ، ئەو گەلەك دچوو نەخوشخانا بۆ ماوێ سێ سالان یێ بەردەوام بوو ، داکو چارەسەرییێ ببینیت بەلێ یا بێ مفا بوو ، و ل دوماهیك سالێ برایێ وی برپاردا چارەسەریا خۆ تنێ ب قورئانێ بکەت .

پشتی بورینا سێ هەیڤان هەڤالێ من پەیوەندی ب من کر و دکرە گری و گوت : برایێ من یێ ژ نەخوشییێ قورتال بووی .

گەلەك کەیفا وی هات ، و هەمی لەشێ من گرش بوو دەمێ دگوتی برایێ من بۆ ماوێ سێ هەیڤان هەردەم قورئان دخاند ، خودایێ مەزن ژ مەزنترین بەلا قورتالکر .

لەوما هەردەم قورئانێ بخوینە ، پشتی ماندیبوونا لەشی و روحی دێ ئارامیێ و ڕەحەتیێ بینی ، و ل رۆژا دووماهیێ قورئانا پیروز دێ هێت شەفاعەتێ بۆ خودانێن خۆ کەت هەروەکی پێغەمبەری ((سلاڤ لێ بن)) گوتی : ((اقرؤوا القران فإنه يأتي يوم القيامة شفيعا لأصحابه))

ئانکو : ((قورئانێ بخوینن ل رۆژا قیامەتێ ئەو دێ هێت شەفاعەتێ بۆ خودانێن خو کەت))

رواه مسلم .




دچن و مه دهێلن

بهلێ چ زیانێ ناگههینن .

راسته چوونا وان گهلهك یا نهخۆشه ..

بهلێ ب جوانی ههره

ههروهكی چهوا ب جوانی تۆ نیاسی و حهشته كری .

⚽•●●—☺ئارامبە☺—●●•⚽

سەرنجراكێشیێ و حەژێكرنێ تێكهەل نەكە ..

حەژێكرن ب دەگمەنی دهێت ..

و سەرسام بوون ژی گەلەك دهێت ..

ئەگەر حەژێكرن و سەرنجكراكێشی تێكهەل بن بزانە تۆ عاشقی .

ئارامبە

دیتنێن خەلکی بۆ تە د جودانە ..

ب خەم نەکەڤە ئەگەر ڤی و یێ هەنێ تۆ ب خرابی دیتی ..

ب تنێ خودایێ مەزن راستییا تە دزانیت .

**⊛•●●—☺ئارامبە☺—●●•⊛**

**چێدبیت هندەك كەس ژ بەر هندەك ئەگەران بچن .**

**گەلەك ئەگەر یێن هەین ناهێنە هژمارتن ، بەلێ بزانە یێ بـەرهڤ تەڤـە بهێت :**

**یان ژ نشكەكێڤەیە ..**

**یان غەریبیێ دلێ وی یێ سووتی ..**

**یان بەرژەوەندیەك یا هەی دڤێت ب دەستڤەبینیت .**




وەكى زێرى نەبە ل پێش چاڤێن هەميان د تەيسيت و د برسقيت .

وەكـى گەوهـەرەكى بـە دنـاڤ كويراتيـا نـەردى دا كەسـەك ب دەستڤە نائينيت ژبلى وى يێ خۆ بۆ ماندى دكەت .

❁•●●—☺ئارامبە☺—●●•❁

ئەز هەتا رادەكی یێ نەزان بووم من ژیانا خۆ ل بن رەفتارێن كەسەكی دبیت و من چ تشتەك بو خو نەدكر ؛ تنێ من خو ل بن فەرمانا دبیت هەروەكی ئەز یێ ل بن كارتێكرنا ماددەییێن بێ هوشكەر .

☸•●●—☺ئارامبه☺—●●•☸

باوەریێ ددەمینە کەسەکی و دشکێنیت و ناهێلیت ..

ب راستی مە ئێک خوش دڤێت ب هێلان و پاشکوھ هاڤێتنا خو مە دکوژیت ..

بلا ب تنێ تە باوەری ب خو هەبیت و ل خو ئاشق ببە ، بلا حەژێکرنا تە بوتە یا راست و دروست بیت ..

چونکی تو ب تنێ یێ ژ هەژی وێ چەندێ ی .




ئەز روينشتم من بۆ چەند جاران دووبارە رێيا مێريێ گرت ، بەلێ هەردەم مێريێ رێكەكا ديتر دگرتە بەر ؛ و بێ هيڤی نە دبوو دا كو دەربازببيت ، ئەز روينشتم و من هزرا خۆ كر ..

چەوا مێريێ هندە شيان و حەز هەنە هەتا دگەهتە وی جهێ وێ دڤێت ، و ئەم وەك مرۆڤ ئەگەر هيڤيەكا مە يا ب تنێ ژی ب جە نەهات دێ خۆ ب دەستڤە بەردەين و وی تشتێ مەدڤێت د هێلين !؟

۞•●●—☺ئارامبە☺—●●•۞

بڕیارێ ل سەر من نەدەن ، بەلکۆ بڕیارێ ل سەر خۆ بدەن ، ئەز وەکی خودیکێ مە وی تشتێ د ناڤیبا خودا بەروفاژی ناکەم .

❀•●●——☺ئارامبە☺——●●•❀

**رولێ قازی نەگێرە و بڕیارێ ل سەر کەسێن دیتر نەدە ، کەسێ داخاز ژ تە نەکریە مایێ خۆ دکار و بارێن وان دا بکەی .**

❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

دێ دەمێن خۆشیێ و نەخۆشیێ هێن ..

بۆ من نەیا گرنگە ، چونکی دێ هەمی بنە بیرهاتن ..

دێ خۆشیێ ب دەمێن خۆش بەم ، و ل پاشەرۆژێ دێ ب خەمێن خو کەمە کەنی و دێ بێژمە خۆ : ئەرێ ژبەر چ ئەز ل وی دەمی ب خەم کەتم ؟!

😯•●●—☺ئارامبه☺—●●•😯

ئەگەر روحا تە تژی خەم بوو بزاڤێ بکە کەسێن دیتر بەختەوەر بکە ،

ئەڤە باشترین رێکە تو هەست ب ڕازیبوونێ بکەی .




پڕانیا جاران ئەز بۆ خۆ ب خەم دکەڤم ؛ ل وی دەمێ ئەز ل سەر پرسەکێ پشتەڤانیا دلێ خو دکەم ... دهەمان دەمدا مێشکێ من خودانێ بڕیارا دروستە .

⊛•●●—☺ئارامبه☺—●●•⊛

دەمێ تۆ ب هاریکاریا خەلکی رادبی و بەختەوەردکەی

ج جاران هیڤیا وان نەبە وەکی ئێك بن ، هەتا ئەگەر چل کەسێن

وەکی تە بهێنە دیتن ژی وەکی توخمێ تە نابن .

❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

هەردەمێ ئەز هەست ب تەنگیا ڤێ جیهانێ دکەم بیرا من ل ماموّستاییّ من دهێت دەمێ دگوتی : خەم د ڤێ دونیاییێ دا وەکی بازنەکێ یە تەنگ دبیت و تەنگ دبیت و تەنگ دبیت ..

وئەڤ بازنا تەنگ دبیتە خالەکا بچویك و بەرزە دبیت ؛ و ئەڤ چەندەژی ژ وێ بەرفرەهییێ یە یا خودێ ددەت .

❀•●●—☺ئارامبه☺—●●•❀

ل ڤێرێ هندەك كەس یێن هەین نە ژ هەژی حەژێكرنا تەنە ، چونكی ئەو دزانن دلێ تە ل هەمبەر وان یێ ژارە و دێ وی دلی بریندارکەن و دزانن ب تنێ دلێ تە ئەو دڤێن ، لەوما دێ وی دلی ژناڤ بەن ..

و ب ڤی رەنگی دلێ خوشتڤی چ تشتەك نەڤێت ژبلی ماندیبوونێ و ئێشانێ دگەل وان كەسێن كو تە هزر دكری ئەو مروڤن .

❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

تۆهەردەم سەرسامی وان کچکا دبی یێن ژیانا وان ل سەر زەلامەکی د زڤریت ، و مەرەما وان یا سەرەکی دبیتە پێکئینانا ژیانا هەڤژینییێ !

رێزدارا من ..

وان پێدڤی یا ب تە هەی و نە ب بەرۆڤاژی .

۞•●●—☺ئارامبه☺—●●•۞

چەند ڤیانا زەلامی بۆ ژنێ پتر بیت ، جهێ دایکا وی هەردەم دێ یێ ئێکێ بیت ددلێ وی دا ، بزاڤێ نەکە ڤی جهی بگری داکو حەژێکرنا وی ژ دەست نەدەی ..

و ئەگەر ئەڤ جهە دا تە ، ل ریزا ئێکێ دا پەیڤا ((زەلام)) ژێ ببە و ل شوونا وێ بنڤێسە ((چ نە)) چونکی چ تشتەك پشتی خودایێ مەزن ژ دایکێ مەزنتر نینە ..

خودایێ مەزن رەحم یا ل سەر خۆ نڤیسای
و دلۆڤانیا خودێ یا ل پێش تورەبوونا وی کەتی ..
ئەڤ خەسلەتە یێ د قورئانا پیرۆز دا هاتی پتر ژ سەد و شێست بابەتان دگەل پێکهاتەیێن وێ و پێناسەیێن وێ ژی ، خودایێ مەزن دبێژیت :
هزرا خو بکە خۆشتڤیێ من ..
هزرا خو بکە خۆشتڤیا من ..
رەحما خودێ هەمی تشتەکی ڤەدگریت ؛ راستە ؟
پا ڤێجا چەوا تەژی ڤەناگریت تۆ چ تشت نینی دناڤ هەمی گەردوونێ مەزن و بەر فرەهـ دا ، لەوما ژ رەحما خودێ بێ هیڤی نەبە مادەم تە ئاگەهداردکەت و ویژدانا تە د کرنا گۆنەهەکێ دا هشیار دکەت ..
ئارامبە . خودایێ مەزن سەد رەحم یێن داین ، هەروەکی پێغەمبەرێ مە موحەمەدی ((سلاڤ لێ بن)) گوتی : ((إن الله يوم خلق السموات ولأرض مائة رحمة ، كل رحمة طباق ما بين السماء ولأرض ، فجعل منها في الأرض رحمة ، فيها تعطف الوالدة على ولدها ، والوحش والطير بعضها على بعض ، فإذا كان يوم القيامة أكملها بهذه الرحمة))
ئانکو : ((رۆژا خودێ ئەرد و ئەسمان چێکرین سەد رەحم دان ، هەر رەحمەك چینەکە دناڤبەرا ئەردی و ئەسمانی دا ، رەحمەتەك دانا سەر ئەردی ، دایك وێ رەحمێ ب زاروکێ خو دبەت ، و درندە و بالندە ب ئێکتر دبەن ، ڤێجا ل روژا قیامەتێ ئەڤ دلۆڤانیە دێ تەمام بیت))
صحيح مسلم
هزرا خۆ د رەحم و دلسۆزیا دایکا خۆ دا بکە ئەڤە چ نینە ل پێش وان ((٩٩)) رەحمێن ل روژا قیامەتێ .




**چێلبیت :**

**خودایێ مـەزن وەل تەبکـەت تـۆ ژ نشـکەکێڤە هنـدەك كەسـان ببینـی گەلەك خێرێ ژێ ببینـی دلێ تـە تـەنابیت و بزانـی هێشـتا دونیـا یـا ب سلامەتە .**




دەمێ دگەل زاروکەکی د رووینیە خار دێ ب بێ ئەگەر پێ دلخۆش بی.

و دەمێ تۆ دگەل کەسەکی دانعەمر د رووینیە خار دێ ترسی ، و نزانی ئەڤ ترسە ژ کیڤە دهێت .

بخەم نەکەڤە و دوو دل نەبە

مرۆڤێن دانعەمر ئەون یێن هەڤرکیا ژیانێ کری و شەڕ دگەل زەحمەتێ و گرانیا وێ دا کری د هەمان دەمدا یێن زارۆك د بێ گونەهن ژ تەنگاڤیێن ژیانێ .

۞•●●—☺ئارامبە☺—●●•۞

نەیا گرنگە تۆ ببیە دیاریەکا بها گران ..

و نەیا گرنگە تۆ یێ ماددی بی ..

راوەستانا تە دگەل لایەنێ خەمبار باشترین دیاری یە تو پێشکێشی وی

کەسی بکەی یێ کو دوهی پێدڤی پێ هەی .




پڕانیا جاران حەزێکرن پشتی کەرب و کینێ دهێت ، بەلێ ج جاران ب بەرۆڤاژی رووی نادەت چونکی دەما ژ راستا تە کەسەك بڤێت نە ب گوتنێ یە و دڤێت هەمی کێماسیێن وی قەبوول بکەی ، ل وی دەمی ج تشتەك نامینیت ببیتە ئەگەرێ کەرب و کینێ .

❁•●●——☺ئارامبە☺——●●•❁

بەری تۆلا خۆ ژ کەسەکی ڤەبکەی باش هزر تێدا بکە ؛ دێ بینی ئەو نەیێ ژ هەژی یە تو دەمێ خۆ پێڤە ببورینی ، بابەتێ ئێکلاکرنێ یێ ل دەف دروستکەری نە ل دەف دروستکریانە .. ئارامبە .

❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

ب خودانێن دیمێن بێ گۆنـەه نەهێیـە خاپانـدن ، نـە هـەر تشـتەکێ د برسقیت زێره .

☺ئارامبه☺

دووڤ رویێ دەرەکی برپیارێ ل سەر کەسێ نەدە ، تۆ نزانی کا چ د ناڤیا وی دا هەیە ژ باشییێ یان ژ خرابیێ . گۆمانێن خراب ؛ ب کەسێ نەبە و تومەتا نەدە پال کەسێ .




كەنيا من دهێت دەمێ ژن دبێژيته هەڤژينێ خو : گێولێ ته نەيێ جوانه ، و ب بەرۆڤاژى دگەل هەڤژينێ ؛ دەمێ هەڤژينێ وێ دبێژيتێ : گێولێ ته نەيێ جوانه ، ب ڤان ئاخڤتنا ئەو زيانێ دگەهيننه ئێكتر .
ئەگەر گێولێ هەڤژينێ ته يێ كرێت بيت زەلامێ ته دناڤ مليون ژنا دا تو يا هەلبژارتى دا ب بييه هەڤژينا وى ، و ب بەرۆڤاژى هەڤژينا ته ژى تۆ يێ هەلبژارتى داكو ببيه هەڤژينێ وێ ، ڤێجا ئاخڤتنێن زڤر و دبنه ئەگەرێ دلانێ نەبێژنه ئێكتر بونموونه : تو يێ كرێتى يان تو يا كرێتى يان تو يێ نه جوانى و ...... .




دەمێ ژ دایکبوونەکا نوی دبینم دلێ من دسوژیت ؛ تو دزانی ژبەر چ ؟ چونکی ئەز دزانم دێ رووی ب رووی نەخوشترین و ب ترسترین وان تشتا بیت یێن ئەم نوکە توش دبینێ ، دەم یێ بەرەڤ پێش دچیت و رەوشت بلندی بەرەڤ نزماتیێ و کێمبوونێ یە .

۞•●●▬☺ئارامبە☺▬●●•۞

بێژە من ئەو کینە یێن تۆ حەژێدکەی و تێکهەلیا وان دکەی ... دێ زانم تۆ کی .

ئارامبه

ژ ڕابردوی فێربه ، دا پەشیمان نەبی .

❁•●●—☺ئارامبە☺—●●•❁

جوانیا زەلامی یا د کارێ وی دا ، نە د بەریکا وی دایە .

❀•●●—☺ئارامبه☺—●●•❀

د ژیانێ دا هەردەم سەحکە لایەنێ ئەرێنی ، ئەگەر تە چ نەدیت سەحکێ چەوا دێ لایەنێ نەرێنی بۆ لایەنێ ئەرێنی گوهری .

❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

باش گوهێ خۆ بده مرۆڤان بەلێ باوەر ژ هەر ئاخفتنەکێ نەکە یا دهێتە گوتن .

❂•●●—☺ئارامبە☺—●●•❂

نهێنییێن خـــۆ د زکـێ خـودا بهێلـه ، ئـهو ب تنـێ بـۆ خـارنێ نەهاتیـه چێکرن .



دلۆڤـانيێ ب كەسـێن ديـتر ببـە و يـێ دلسـۆز بـە دگـەل وان ، ئـەم ب كريارێن خۆ ناچينە بەهەشتێ ، بەلكۆ دێ ب دلۆڤانيـا خـودێ چين ب ئانەهيا خودێ ، ئەگەر تۆ وەسا هزربكەی دێ ب كريارێن خۆ چييە بەهەشتێ دێ سەيێ تە يێ وەفادار چيت ئەگەر نەبيتـە ئـاخ و خـودێ حەز ل سەر وێ چەندێ هەبيت .

❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

کەسێن لاواز مەحالێ ((مستحیل)) ڤەدبینن ..

چونکی مەحالێ چ هەبوون ل دەف کەسێن مەزن نینە .




ئاقلێ مروڤێن شەهرەزا وەکی دەریایا نە ..

بێ بەرفرەهە ب زانینێ و بێ ئارامە د هزرکرنێ دا ..

و مرۆڤێ شەهرەزا و زانا دەنگێ خۆ ل سەر کەسێ بلند ناکەت .



پیلانگێرییێن مەزن نە ب تنێ ب ئافرەتان ڤە دگرێداینە !

یەعقوبی ((سلاڤ لێ بن)) گوت : (( قَالَ يَا بُنَيَّ لَا تَقْصُصْ رُؤْيَاكَ عَلَى إِخْوَتِكَ فَيَكِيدُوا لَكَ كَيْدًا))

ئانکو : ((کوڕێ من خەونا خۆ بۆ برایێت خۆ نەبێژە ، ئەگەر تۆ خەونا خۆ بۆ وان بێژی دێ پیلانان بوتە دانن ، ب راستی شەیتان بۆ مرۆڤی دوژمنەکێ ئاشکەرایە دێ حەسەدێ ئێخیتە ددلێ وان دا ، و وان د بەر دژمنایی یا تەرا کەت))

پیلانگێرییێن زەلامان ژی گەلەك د مەزن و دزوارن .

❀•●●—☺ئارامبە☺—●●•❀

هەر كەسێ ل دونیایێ دگەل خودێ بیت دێ دونیا خزمەتا وی كەت و هەر كەسێ ل دونیایێ دا ژ خودێ دویربكەڤیت دێ دونیا وی شكێنیت و بێ بها كەت .




ژن ب سێ تشتان گەلەك مەزن دبيت :

ب خو پاراستنێ دا

ب رەوشت بلنديێ

ب كارێ خۆ .

۞•●●—☺ئارامبه☺—●●•۞

ئەو هەڤالێ نهێنیێن تە دزانیت گەلەك مەترسیدارترە ژ دوژمنەكێ تە یێ تورە ، لەوما یێ هشیاربە !

❁•●●—☺ئارامبە☺—●●•❁

د كەساتيا خۆ دا ئەم يێن بهێزين ..

بەلێ تشتەك هەر يێ هەی ئەم ل بەرامبەر لاواز دبين .

نەيا ب ترسە و نە كێماتييە ، و جهێ وی يێ دناڤا دلی دا .

❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

**کەس تەمام ب دلشادی ناژیت ، هەتا بەختـەوەریا ب تـەمامی ژی یـا ب ترس و دوو دله .**

❀•●●—☺ئارامبه☺—●●•❀

حەژێکرن نە خۆشکاندن و لاوازییە ، حەژێکرن هێز و قوربانی دانە ، یێ ب دروستاهی حەشتە بکەت ، دگەل تە ناکەتە گری ل سەر وی تشتێ ب سەرێ تە هاتی ، بەلکۆ دێ پشتی خودێ شیانێ پێشکێشی تە کەت داکو قەستا وی بکەی .

❀•●●—☺ئارامبه☺—●●•❀

دناڤبـەرا خۆشـتڤیان دا کەرامـەت نینـە ، چـونکی کەرامـەتا تـە ژ کەرامەتا وییە ، هوین دوو کەسن د لەشەکی دا .



سۆپاس بۆ خودێ ل سەر هەر تشتەکی ...

سۆپاس بۆ خودێ ل سەر تشتێ چووی ..

و سۆپاس بۆ خودێ ل سەر وی تشتێ دهێتە رویدان ..

تۆ ب راستی نزانی هەتا چ رادەکی خودێ دگەل تە یێ دلۆڤانە !

تۆ نزانی ئەو چەوا تشتێ تە دڤێت ژ تە دویر دکەت د هەمان دەمدا کو خرابییا تە یا تێدا ؛ تۆ نزانی ب تنێ ئەو دزانیت ..

تۆ نزانی چەوا مرۆڤان بۆتە بەردەست دکەت و ژ نشکەکێڤە بو تە دئینیت ..

تۆ نزانی چەوا خێرێ نێزیکی تە دکەت تو وەسا هزر دکەی خرابییا تە یاتێدا ..

تۆ نزانی چەوا ئەو روحا تە دزڤرینیت و تۆ یێ نڤستی داکو کریارێن باش ئەنجام بدەی بەری هەمی تشت ب دووماهیك بهێن ..

تۆ نزانی چەوا تە دنێختە د تەنگاڤیان دا هەتا گۆنەهێن تە ژێدبەت جهێ ئێکانە یێ رامانا کەرامەتێ و خوراگرییێ ددەت جهێ تەیە دناڤ دەستێن خودێ دا .

❀•●●—☺ئارامبه☺—●●•❀

پێنج تشت زەلامینیا مرۆڤی کێم دکەن :

نڤێژ هێلان

نەگۆهداریکرنا دەیبابان

خرابی و توندو تیژی ل بەرامبەر ژنێ

درەو

قەلسی .

❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

جوانترین ئاخفتن یا دگەل خودێ یە دناڤ سوجدێ دا ..

دێ هەمی ئێش و نەخوشیێن دناڤا دلێ تەدا دەرکەڤن و دێ تـژی بیـت ژ بەختەوەرییێ .



**هەردەم بێژە : یا خودێ ل ڤێرێ خەلك یێن هەین حەزدکەن ب وانڤە بهێمە گرێدان ..**

**ئەی خودێ ئەز گەلەك پتر ژ وان یێ پێدڤی ب تەمە من ب خۆ ڤە گرێدە .**

۞•●●——☺ئارامبه☺——●●•۞

جوانه تۆ دناڤیا خودا رووی ب رووی خەمەکا کویر ببی ، و بیرا خۆ ل ڤێ ئایەتێ بینی : ((لَا تَدْرِي لَعَلَّ اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَلِكَ أَمْرًا))

ئانکو : ((تۆ نزانی بەلکی خودێ تشتەکی بکەت ل سەر هزرا تە نەبیت)) .

۞•●●—☺ئارامبە☺—●●•۞

یێ ب دروستاهی حەشتە بکەت تە ناهێلیت ..

و دێ ژ چونەییێ تشتەکی چێکەت داکو دگەل تە باخڤیت .

❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

کارێ خێرێ و دجهێ خودا بکه ، و پشتی هینگی بهاڤێـژه ددەریـایێ دا ج جاران بو خەلکی بەحسی باشییێن خوٚ نەکە .

❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

**من بەختەوەری ژ خودێ خاست تو پێشكێشی من كری ..**

**هەمی دێ چن ، و تۆ دێ مینی ..**

**چونكی ئەز بەختەوەریێ نابینم ئیللا ب تە نەبیت .**

⚽•●●—☺ئارامبه☺—●●•⚽

یا ب خەمە تۆ کەسێن باش دهەمی لایەنەکی دا ببینی و پشتی هینگی خراب دەرکەڤن .

❀•●●—☺ئارامبە☺—●●•❀

دەمێ تۆ دگەل پڕانیا خەلکی ل سەر رەحمەتا خودێ دئاخڤی دێ ژ تە دویرکەڤن ، نەکو وان نەڤێت گوه ل تەببیت ..

بـەلکۆ ئـەو د گونـەهێن خـودا د خەنـدقی نـە و شـەرم ژخـۆ دکـەن گوهدارییا تە بکەن کو چەوا رەحما خـودێ هـەمی تشت ڤەگرتییـە و وان ژی ڤەدگریت .

❀•●●——☺ئارامبه☺——●●•❀

دەمێ کەسەکێ خراب شانازیێ ب کریارێن خۆ دبەت ، و یێن چاك خۆ بێدەنگ دکەن ..

ل ڤێرێ دێ هەست ب کرێتییا دونیایێ کەی .




داخازیەك بۆ من و تە :

بـەلكی ب گرنـژین ڤـە ل دەف حـەوزێ بگەهینـە تـە ئـەی پێغەمبـەرێ خودێ ، و بهێینە دەستێ تەیێ پلە بلنـد و قـەبوول بکـەین داكو تێهنـا مـە بشكێنی و ڤەخارنـەكێ بدەیـە مـە و كـەس پشـتی هینگـی تێهنـی نەبیت .

۞•●●—☺ئارامبه☺—●●•۞

ل ڤێرێ هندەك كەس یێن هەین ئایینی دكەنە خەمل و جوانی و رەوشتی دكەنە پێلاڤ

هشیاربە وێ هزرێ نەكە كو تۆ ب تنێ مۆسلمانی ، و ئەركێن خۆ ب جوانی بجە بینی و دهەمان دەمدا ئەزمانێ تەنەڤێت دگەل تە بمینیت ژبەر پیساتی و بێخێرییا وی .

❁•●●—☺ئارامبە☺—●●•❁

ئەی خودا من گەلەك بو روژا دووماهيێ حازر نەكريە ، بەلێ دلێ من يێ بو حەژێكرنا تە و پێغەمبەرێ تە دكەتە هەوار ، ئەی خودا ژ تە دخازم ل رۆژا دووماهيێ من دگەل پێغەمبەری كۆم بكەی ؛ چونكی ئەز مروڤەكی ژ وی مەزنتر نا دانم .

۞•●●—☺ئارامبە☺—●●•۞

**هەمی ئەو کەسێن ب پەیڤەکا ب تنێ ژی زیان گەهاندیە تە خودایێ مەزن دێ لێپرسینێ دگەل کەت ..**

**ب خەم نەکەڤە و دوو دل نەبە ، خودایێ مەزن د لێپرسینا خودا یێ دادپەروەرە .**

❀•●●—☺ئارامبە☺—●●•❀

ژ وان تشتێن مرۆڤی دلشاد دکەن :

دوعا

کۆمبوونا مرۆڤێن مرۆڤی

قەهوا سپێدا .



بهایێ نەفسا خۆ بزانە داكو خەلك كارتێكرنێ ل كەساتیا تە نەكەن ، نە هەر كەسەكێ دچیت دبیتە جهێ لێبورینێ .




ئەرێ تۆ دزانی خودایێ مەزن نەڤێت تە ئەشکەنجە بدەت ؟

وی تەوبە و تەسبیح ب بێ مفا نە داینە ..

خودایێ مەزن بەندەیێن خو تاقی دکەت دا وان ژ گۆنەهان پاقژ بکەت ، ڤێجا کا چەوا ئەو دێ مە قەبیل کەت پاقژی و بێ کێماسی و مەزناهی هەر یێن وینە ..

دگەل خودێ بە و بێ ئارامبە .

((وەکی خۆ بکە تۆ دێ گەهیێ .. ڕێسایەکا جوانە))

یێ تەنگافیەکێ ل سەر برایێ خۆ یێ مۆسلمان راکەت خودێ تەنگافیەکێ ژ تەنگافیێن رۆژا قیامەتێ دێ ل سەر وی راکەت ..

و یێ مۆسلمانەکی بپارێزیت خودێ ل دونیایێ و ئاخرەتێ دێ وی پارێزیت ..

دلۆڤانیێ ب وان ببەن یێن ل سەر ئەردی ؛ یێ ل ئەسمانا دێ دلۆڤانیێ ب هەوە بەت . .

یێ کارەکێ برایێ خۆ بجە بینیت خودێ ژی دێ کارێ وی بجە ئینیت ..

خودێ هاریکارێ بەندەیێ خویە مادەم بەندە هاریکارێ برایێ خویێ بسلمانە ..

و ئبن مەسعود دبێژیت :

یێ بۆ خودێ خارنێ بدەت دێ خودێ خارنێ دەتە وی ..

یێ بۆ خودێ تێهنا کەسەکی بشکێنیت دێ خودێ ژی تێهنا وی شکێنیت ..

و یێ بۆ خودێ ببوریت خودێ ژی دێ ل وی بوریت ..

هیڤییە ..

بخەم نەکەڤە ئەگەر بێ رەوشتیەك ل هەمبەر تە بهێتە کرن ..

ب تنێ بگرنژە چونکی دێ خودایێ مەزن سزایێ وی دەتێ ..

وەسا سەرەدەریێ دگەل خەلکی بکە هەروەکی چەوا تە دڤێت خودێ سەرەدەریێ دگەل تە بکەت .

ئەو كى بە بێ تۆ هيڤيا دكەى بەرسڤا تە بدەت ؟

كەسەك ژ هەوە هەيە ژيان هێلابيت بەرسڤێ بدەت ؛ ئانكو گەلەك حەز بكەت بەرسڤا ئێك ژ نێزيك و خــــوشتڤى يان هەڤالێن خو بدەت ..

و بەرسڤێن جودا يێن هەين ..

تۆ چ دبێژى ئەگەر بێژمەتە پێغەمبەرێ خودێ موحەممەد ((سلاڤ لێ بن)) دێ بەرسڤا تە دەت !؟

پێغەمبەر ((سلاڤ لێ بن)) دبێژيت : ((ما من أحد يسلم علي إلا رد الله علي روحي حتى أرد عليه))

ئانكو : ((نينە كەسەك سلاڤا ل من بكەت ئيللا دێ خودێ گەهينتە روحا من داكو بەرسڤا وى بدەم))

و هەروەسا پێغەمبەر ((سلاڤ لێ بن)) دبێژيت : ((وصلوا علي فإن صلاتكم تبلغني حيث كنتم))

ئانكو : ((سلاڤا ل من بكەن سلاڤێن وە دگەهنە من ئەگەر هوين ل كيڤە بن))

و ئەڤە شانازى يە بۆ هەمى خەلكى كو پلەبلندترين چێكرى موحەممەد ((سلاڤ لێ بن)) بەرسڤا وى بدەت يێ سلاڤ دكەتێ ..

سلاڤ كەنێ ...

❁•●●──☺ئارامبه☺──●●•❁

نامەیەك بۆ خوشكێت من ..

چێدبیت تۆب وێنەیێ خوڤە یا جوان بی ، بەلێ .... !

تۆ دبینی یێن دەورۆبەرێ تە یێ شوی كری و رەنگ و سەروسیماییێن وان گەلەك د سادەنە ...

تۆ دزانی ژبەر چ ؟!

رێسایەكا بچووك ل سەر نێزیكبوون و گرێدانا تە ب خودایێ مەزن ڤە ..

پێغەمبەر ((سلاڤ لێ بن)) دبێژیت : ((إن الله لا ينظر إلى أجسامكم ولا إلى صوركم ولكن ينظر الى قلوبكم))

ئانكو : ((خودێ ناسەحكەتە لەشێن هەوە و وێنەیێن هەوە بەلكۆ سەحدكەتە دلێن هەوە)).

بەلێ ئەگەر تۆ بەردەوام بووی ، كەس ناهێت ئیللا زەلامەكێ پویچ نەبیت ، و دێ ب وێ هە و وا هە سەرسام بیت هەروەكی تو وێ چەندێ دكەی ..

دگەل خودێ بە ؛ دێ هەمی تشت دگەل تەبن .

❁•●●—☺ئارامبه☺—●●•❁

ئەگەر گوهداریا سترانا ژی بکەی خانـدن و گوهـدانا قورئـانێ نەهێلـە ؛
ئەگەر تۆ بێ ئەمریا خودێ ژی بکەی ب چ رەنگەکی نڤێژا نەهێلە ..
ئەگـەر ژیانـا تـە بـەرەڤ نـەمانێ و نـەمانێ و نـەمانێ ژی بچیت ؛ ب چ رەنگەکی دەرگەهێ دناڤبەرا خو و خودێ دا نەگرە .

نەیێ دوو روی
و نەیێ نموونە
و نەیێ هەڤدژم..
شیرەتا من بو تە ئەوە تو ژ من باشتر
خودایێ مەزن هێز یا دایە تە داکو خو
ئەز شیرەتا حەزێکرنێ ل تە دکەم ،
نە سلماندنە کو ئەز ژ هەمیان باشترم .